# میخاییل باختین

## سەودای وتووێژ، پێکەنین و ئازادی

کۆمەڵە وتار

وەرگێڕانی

د. بەختیار سەجادی



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- میخاییل باختین سەودای وتووێژ، پێکەنین و ئازادی
- وەرگێڕانی: د. بەختیار سەجاری
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- پیتچنین: نەرمین ئیبراهیم
- بەرگ: هۆگر سدیق
- ژمارەی سپاردن: ٩٥٢
- نرخ: ٢٥٠٠
- چاپی یەکەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٢٤٨)



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆک

## پێشەكیی وەرگێڕ

**١. سەرنجێك لەسەر تیۆرییەكانی باختین:**

دەیڤید لاج لە كتێبی *ڕەخنە و تیۆری مۆدێرن*دا دەڵێ: «ژیان و بەرهەمەكانی میخاییل باختین و ڕادەی وەرگرتنی ئەو بەرهەمانە لە پێش و پاش مەرگی خۆی، یەكێكە لە چیرۆكە هەرە سەرنجڕاكێشەكانی مێژووی ڕۆشنبیریی مۆدێرن.» (لاج ١٩٩٣:١٣٤)

ئەم ڕستەیەی دەیڤید لاج لە كتێبی ناوبراودا هۆی سەرەكیی گەڕانی من بوو بەدوای «ژیان و بەرهەمەكانی باختین»دا. ئەوكاتەی ئەم كتێبەم دەخوێندەوە خوێندكاری ماستەری زمان و ئەدەبی ئینگلیزی بووم لە زانكۆی تاراندا‌و، هەر خێراش هەوڵم دا لەنزیكەوە ئاگاداری هزر و ئەندێشەی باختین بم.

پاش خوێندنەوەی هەندێ لە بەرهەمەكانی باختین چەند نووسینێكم لە ساڵانی ٩٨و٩٩دا بەمەبەستی ئاشناكردنی خوێنەرانی كورد بە ئەندێشە و تیۆرییەكانی باختین لێرەو لەوێ بڵاوكردەوە و وەرگێڕانی ئەم كتێبەی بەردەستیش هەر بەرهەمی ئەو ساڵانەیە.

لە مێژووی نەك دووروردرێژی تیۆریی ئەدەبیی مۆدێرن‌و كۆمەڵناسیی ئەدەبدا بێگومان میخاییل باختین بە یەكێك لە



بەرجەستەترین و كاریگەرترین بیردارێژانی ئەم ئاقارە ڕەخنەیی و تیۆریكە دادەنرێ. لایەنە جیاجیاكانی ئەندێشەی ئەم بیرمەندە ڕووسییە بەشێوەیەكە كە ڕەخنەگر و تیۆری داڕێژێك وەك تێزڤێتان تۆدۆرۆڤ پێی وایە باختین گەورەترین تیۆری داڕێژی ئەدەبە لە سەدەی بیستەمدا. ژیانی فیكریی باختین بەسەر دوو بەشی سەرەكیدا دابەشدەكرێ: یەكەم ساڵانی دەستپێك و كۆتایی ژیانی و دووهەم ساڵانی نێوەندی. لە قۆناغی یەكەمدا ڕووبەڕووی فەلسەفە كارێكی نیئۆكانتی دەبینەوە و لە قۆناغی دووهەمیشدا باختین وەكوو ڕەخنەگر و تیۆری داڕێژێكی ئەدەبی لەقەڵەم دەدرێ. هەر دوو قۆناغەكەش تاڕادەیەك هاوكاتە لەگەڵ دەسەڵاتی پاوانخوازی ستالین لە سۆڤیەتی پێشوودا و ئەو بارودۆخە پڕ لە سانسۆڕەی ڕژێمی ناوبراو بۆ بیرمەندان و هزرڤانانی هێنابۆوە كایەوە. هەر ئەم هەلومەرجەش بووە هۆی ئەوەی كە بەرهەمەكانی باختین پاش نزیكەی چل ساڵ (واتە، لە سەرەتای شەستەكانەوە بەم لاوە) ئاراستەی كۆمەڵگای فیكریی ڕۆژئاوا بكرێ.

باختین ئەو بیرمەندەیە كە بەرهەمەكانی، بەهۆی چەشنی تایبەتی جیهانبینییەوە كە دژی دەسەڵاتداریێتی ڕەهاخواز و تاكدەنگی ڕابەرانی سۆڤیەتی پێشوو وبەتایبەت ستالین بوو، زۆربەی كات بەناوی خوازراوەوە و بەناوی هاوڕێكانیەوە لەچاپ دەدران و هەروەهاش زیاتر لە سی ساڵ بۆ باشووری وڵات دوورخرایەوە و لە تەنیایی و تەریكیدا و لەگەڵ نەبوونی ئامراز و كەلوپەلی نووسین و تەنانەت هەندێ جار بە بێ كاغەزو كتێب خەریكی بیركردنەوەو تیۆری سازیی بوو. پاش كۆنگرەی بیست و یەكەمی حیزبی كۆمۆنیست, بەتایبەت پاش لێدوانە بە ناوبانگەكەی خرۆشچۆڤ لە ساڵی ١٩٥٧دا كە تێیدا

رەخنەی توندی لە هەندێ سیاسەتی ستالین گرت، باختین گەڕایەوە بۆ زێدەکەی خۆی و دەستیکرد بە بەربڵاوترکردنەوەی ئەندێشەکانی و بڵاوکردنەوەی سەر لە نوێی بەرهەمەکانی.

کۆی لایەن و رەهەندە فیکریی و تیۆریکەکانی باختین و سەرجەم روانگە رەخنەگرانەکانی بەشێوەیەکی گشتی لە پێنج تەوەری سەرەکیدا کۆدەبنەوە کە بریتین لە:

١. روانگەی رەخنەگرانە بۆ قوتابخانەی فۆرمالیزم
٢. روانگەی رەخنەگرانە بۆ قوتابخانەی دەروونناسی
٣. شیکاریی نوێکارانەی لایەنی کۆمەڵایەتی زمان
٤. ئاراستەکردنی تیۆرییەکی سەرنجڕاکێش و نوێ و کاریگەر سەبارەت بەسەرهەڵدانی رۆمان
٥. چەشنناسیی رۆمان و بنیاتنانی بوتیقایەکی تایبەت بە رۆمان(*)

سەرەڕای بەرهەمەکانی دیکەی باختین لە رواڵەتی یاداشت و وتار و نامیلکەدا، دوو کتێبی سەرەکیی باختین وەکو هەڵگری بەرچاوترین روانگە تیۆریکەکانی بریتین لە: *پرسەکانی بوتیقای داستایۆڤسکی (١٩٦٣)*و *رابلێ و جیهانەکەی (١٩٦٦)*. لە کتێبی یەکەمدا لەمەڕ داستایۆڤسکی بە شێوەیەکی تایبەت و ژانری رۆمان بەگشتی باسدەکات. لێرەدایە کە بیرۆکەی «رۆمانی چەند دەنگی» و رۆمانی «چەند زمانی» بەرجەستە دەکاتەوە و پەنجە دەخاتە سەر تیۆریی دایالۆجیزم، واتە وتووێژ باوەڕی، کە لە هەندێ رۆماندا بەگشتی و

(*) بۆ زیاتر ئاگاداربوون لەو پێنج تەوەرەیەی سەرەوە بروانە: بەختیار سەجادی و محەمەد مەحموودی، *فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی* بووانە، بەرگی یەکەم، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس، ژمارەی ٣٢٩، ل.٩٦-٩٤، ٢٠٠٤ .



رۆمانەکانی داستایۆڤسکی بەتایبەت دەرکەوتووە. لە بەرهەمی دووهەمیشدا، لێکۆڵینەوەیەکی وردە کارانە و شیکارانە لەسەر کارناڤێل لە چەرخەکانی ناوەڕاست و بەرهەمەکانی رابلێ، شانۆنامەنووسی کۆمیکی فەرەنسای سەدەی شانزدەهەم، بە ئەنجام دەگەیێنێ. هەر لێرەدا باختین ئاماژەش بۆ ئەو بیرۆکەیە دەکات کە زمان لە بنەڕەتدا و بەڕاستی دایالۆژیکە و خەسڵەتێکی وتووێژ خوازانە و لایەنێکی کۆمەڵایەتی هەیە. ئەو پێی وایە هەر کردارێکی زمانی لە چاوەڕوانیی پەرچە کردارێکی زمانیدایە. دیارە ئەم روانگەیەی باختین بەشێوەیەک لە شێوەکان دژی رەهەندە فۆرمالیستییەکانی رەخنەکارییە کە سەرنج نادەنە لایەنی کۆمەڵایەتیی زمان و بە پێچەوانەوە شێوەی بەرهەمیان بە لاوە گرنگە. سەرەتای دەستپێکردنی ژیانی ئەدەبی و فیکریی باختین، واتە بیستەکان، هاوکات بوو لەگەڵ تەشقی کاریگەرێتی و زاڵبوونی روانگە فۆڕمالیستەکان لە ئەدەب و رەخنەدا. فۆرمالیستە رووسییەکان لە دەیەی دووهەم و سێیەمی سەدەی بیستەمدا و لە دوو شاری مۆسکۆ و سەیەنت پیترزبورگ توانییوویان بە ئاوڕدانەوە لە جۆرێ زمانناسیی مەیلەوبنەماخوازانە (وەک ئەوەی فردینان دوسوسوور) و لە رێگەی گرنگیدان بە دەق و جیاکردنەوەی دەق لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ژینگە و کات و شوێن جۆرێک گۆڕانکاریی بنەڕەتی بەسەر توێژینەوە ئەدەبییەکاندا بهێنن. هاوکات لەگەڵ ئەو رەوتە رەخنەییەی فۆرمالیزم، باختین و کۆمەڵێ لە هاوڕێ و هاوڕاکانی، وەک ڤۆلۆشینۆڤ و مێدڤێدۆڤ، ئەنجوومەنێکیان دامەزراندبوو کە خەریکی داهێنانی هەندێ بیروبیرۆکە و تیۆریی تازەبوون لە بەستێنی توێژینەوە ئەدەبییەکاندا. بنەما و بنەواشەکانی ئەم تیۆریانەی باختین و هاوڕێکانی لەگەڵ لایەنە دەرهەستەکانی زمانناسیی مەیلەوبنەماخوازانەی

فۆرمالیستەکان و هەروەهاش لەگەڵ مارکسیزمی رەق و ئۆرتۆدۆکس و بانگەشەکانی دەسەڵاتدارانی رژێمی ستالین دا، بە تایبەت پاش هاتنەسەر کاری ستالین، دژایەتی دەنواند، بەتایبەت لەگەڵ ئەو جۆرە ئەدەبەی بەواقیعخوازیی کۆمەڵایەتی نێوبانگی دەرکردبوو.

ئەگەر فۆرمالیستەکان هەر تەنیا بنەمای لۆژیکی و تەنراوی سەربەخۆی دەقیان بەلاوە گرنگ بوو، باختین زیاتر پەنجەی دەخستە سەر پێوەندیی نێوان دەق و دەقساز. باختین پێی وایە دەقی بە بێ دەقساز یان بەرهەمی بەبێ دانەر نابێتە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوی توێژینەوەکان و پێداگریی فۆرمالیستەکان لەسەر چوارچێوە و بنەما و شێوەی دەق و پشتگوێ خستنی بەستێنی ئامادە لە داهێنانی دەقدا لەلایەن فۆرمالیستەکانەوە سەر لەبەر جۆرێ تایبەتمەندیی بەخشیوەتە روانگە فۆرمالیستەکان کە تێیاندا کەم وکوڕیی زۆر وەبەرچاو دەکەوێ. مێژووی ئەدەب و فۆرمە ئەدەبییەکان بۆ باختین لە راستیدا هەمان مێژووی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانە. وەک کریستاڤیا لەم بارەیەوە دەڵێ: سەرجەم جیاوازییەکانی باختین لە نەریتی شێوەخوازانەی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لە دوو خاڵدا کورت دەبێتەوە کە بریتین لە ئایدۆلۆژیا بارانکردنی دەق و هەوڵ بۆ پۆلێنکاری و پێناسەکردنی سەر لە نوێی چەمکی زمان.

ئەو پێناسەیەی باختین بۆ زمان ئاراستەی دەکا لە پێناسەکەی سوسوور جیاوازە. باختین رەخنە لەو پێناسەیەی سوسوور دەگرێ کە بەو پێیە زمان سیستەمێکی خۆبەڕێوەبەرە و بەندە بە یاساو رێسا ناکۆمەڵایەتی و دەرهەستەکانی خۆیەوە (واتە، لانگ). لەم بارەیەوە رامان سێڵدن دەڵێ: «باختین بەتەواوی تێگەیشتنی ئێمە لە زمان وەکو دەربڕینێکی تاکانە و تاکدەنگ و کۆتایی پێهێنراو کە لە بەستێنی خۆی



دوور کەوتۆتەوە و هەڵگری هیچ جۆرە وڵامێکی چالاک نییە رەتدەکاتەوە.» (سێڵدن ١٥: ١٩٩٣) ئەگەر سووسوور پێی لە سەر ئەم خاڵە دادەگرێ کە لانگ پێویستە ببێتە بابەتی سەرەکیی لێکۆڵینەوە زمانناسانەکان، باختین پێی وایە دەبێ ئاوڕ لە یاساو پارۆل و وتووێژی نێوان کەسەکان بدرێتەوە و بەستێنی ئامادە لەو وتووێژانەدا بەگرنگ و بەنرخ دەزانێ. باختین پێی وایە کە هەر وتەیەک بەجۆرێ وڵامی وتەی پێش خۆیەتی و لە چاوەڕوانی وڵامی پاش خۆیەتی. کەواتە لەم روانگەیەوە، زمان خاوەنی سروشت و بوونێکی کۆمەڵایەتی و دوولایەنەیە.

هەر ئەو روانگەیەی باختین بۆ زمان لەگەڵ گرنگترین و فرەپانترین واتای سەرەکیی تیۆرییەکانیدا یەکدەگرنەوە. بەواتایەکی روونتر، لە باسکردن لەسەر رۆمان و چۆنیەتی سەرهەڵدان و جۆرە جیاجیاکانی، باختین دیسانەوە پشت بەو پێناسەیەی خۆی بۆ رۆمان دەبەستێ. لە *پرسەکانی بوتیقای داستایۆڤسکی* دا پێی وایە کە داستایۆڤسکی خوڵقێنەری رۆمانی چەند دەنگییە و ئەم رۆمانەش نەک هەر رەگوریشەی لە کارناڤێلی سەدەکانی ناوەڕاست و تەنانەت شانۆنامەکانی رابلێ و رۆمانە عەیارانەکانی سەدەی هەڤدە و هەژدەدایە، بەڵکو ئەم جۆرە رۆمانەش بەتەواوی لە رۆمانە تاکدەنگییەکانی هەندێ نووسەر وەک تۆلستۆی بەتەواوی جیاوازە. تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی رۆمانی چەند دەنگی بریتین لە جۆراوجۆریی دەنگەکان و ژمارەی زۆری هۆشیارییە جیاجیا تاکەکەسییەکان کە هەر کام لەمانە بەشێوەیەکی جیاو سەربەخۆ و کراوە ئاراستە دەکرێ. هەروەک سێڵدن ئاماژەی بۆ دەکا: «لەم جۆرە بەرهەمانەدا هیچ چەشنە هەوڵێک بەمەبەستی یەکدەستکردنەوەی

روانگە جیاوازەکانی کەسایەتییە جیاوازەکان نادرێ. لێرەدا هۆشیاریی کەسایەتییەکان لەگەڵ هۆشیاریی نووسەردا یەکناگرنەوە و تەنانەت ئەم هۆشیارییە جیاجیایانەش بەند نین بەهۆشیاریی خوڵقێنەری ڕۆمان و کەسایەتییەکانەوە.» (سێلدن ٤٠: ١٩٩٣)

لە ڕۆمانی چەند دەنگیدا زەینییەت  و هۆشیاریی کەسایەتییەکان بەهیچ جۆرێک ناچێتە ژێر سێبەری دەسەڵاتی گێڕەوەر یان نووسەرەوە. لێرەدا دەنگی نووسەر بۆ خۆی هەر تەنیا دەنگێکی جیاوازە لە پاڵ دەنگە ئامادەکانی تری نێو بەرهەمەکە. بەم جۆرەش روانگەی کەسایەتییەکان کە رەنگە هەر کام سەر بە ئایدیۆلۆژیایەکی جیاواز و تەنانەت لێکدژیش بن، لەگەڵ روانگەی نووسەردا لە یەک ئاستدا جێگیر دەبن و هەر هەموویان بەیەک شێوە لە ئاستێکی هاوسانی بەهاو بایەخدان. باختین لەم بارەیەوە دەڵێ:

> فرەچەشنی و جۆراوجۆریی هۆشیارییەکان و دەنگە سەربەخۆکان و هاودەنگیی تەواوی نێوانیان بەڕاستی بەتایبەتمەندیی سەرەکیی بەرهەمەکانی داستایۆڤسکی دادەنرێ. ئەو بنیاتنەری ڕۆمانی چەند دەنگییە و جۆرێ ڕۆماننووسیی تازەی دامەزراندووە کە تێیدا دەنگە جیاجیاکانی پاڵەوانەکان هەر بە هەمان شێوە دەبیسترێ کە دەنگی دانەر لە ڕۆمانێکی ئاساییدا دێتەگوێ. وتەی پاڵەوان دەربارەی خۆی و جیهانەکەی هەر بەهەمان ئەندازەی گوتەی خودی دانەری ڕۆمانەکە بایەخدارە. (لە ئەحمەدی ١٣٧١:١٠٠)

بەڵام لەلایەکی ترەوە، ئەو تایبەتمەندییانەی سەرەوە لە ڕۆمانی تاکدەنگیدا نابینرێ. لە ئاوەها بەرهەمێکدا ڕووبەڕووی یەک دەنگ و یەک ئایدۆلۆژیا دەبینەوە. نووسەری ئەم جۆرە بەرهەمانە دەنگەکان و



هۆشیارییەکانی تر تێکڕا دەخاتە ژێر سێبەری زاڵی دەنگ و جیهانبینیی تاکڕەهەندی خۆیەوە.

ڕۆمانی چەند دەنگی، بەڵام، لە نەریتی کاناڤێل و کۆمیدیای هەڵبەزدابەزی رابلێ پەیڕەوی دەکات. گەرچی کارناڤێل بە مانای «بەزموشایی» بەکاردێ، بەڵام بەلای باختین-ەوە کارناڤێل کۆی ئەو لایەن و رەهەند و بۆچوونانە دەگرێتەوە  کە تێیاندا تیزوتوانجی نێو کارناڤێل و بەرهەمی پێوەندیدار بە کارناڤێلەوە، دەسەڵاتی رەسمی دەخاتە بەرتیشکی رەخنەی تەوساویی خۆیەوە. ئەم خەسڵەتەش لە کولتوور و هەندێ دەقی سەردەمی کلاسیک و لە چەرخەکانی ناوەڕاست و سەردەمی ڕۆنێسانسدا بەدەر کەوتووە کە باختین لێرەدا زیاتر کارناڤێل و ئاهەنگەکانی شایی و جێژنگێڕانی چەرخەکانی ناوەڕاستی بەلاوە مەبەستە کە تێیاندا دەسەڵاتی تاکڕەهەندی و تاکدەنگی وزاڵی کلێسا و پاپا دەخرایە بەر رەخنەیەکی توند و پڕ لە تیزو توانجەوە.

کارناڤێل زنجیرە قۆناغە سەقامگرتوو و مسۆگەرکراوەکانی چەرخەکانی ناوەڕاست بەراوەژوو دەکاتەوە و کولتوورێکی دیموکراتیک ساز دەکات. لە وەها ساتەوەختێکدا لە جیاتی جیددییەتی سەرکوتکارانەی دەسەڵاتی رەهاخواز، جۆرێک لە پێکەنین و ئازادی سەرهەڵدەدا. لێرەدا دەنگێکی تاک و رەها رووبەڕووی چەندین دەنگی جیاواز دەبێتەوە. نموونەی ئەم کەسایەتییە کارناڤێلیانە هەمان کەسایەتی «فالستاف»ی شکسپیەرە لە شانۆنامەی *هێنری چوارەم، بەشی یەکەم*. فالستاف ئەو کەسایەتییە کورتەباڵاو زۆر قەڵەوەیە کە بەچاوێکی تەنزاوییەوە لە دیمەنە جیاجیاکاندا دەنگە تاکە جیددییەکان دەخاتە بەر رەخنەی پڕ لە تیزوتوانجی خۆیەوەو گاڵتەیان پێدەکا.

هەر ئەم شێوە رووبەڕووبوونەوە پڕ لە تیزوتەس وتوانجە، کە ئەنجامەکەی پێکەنین و ئازادییە، لە سەردەمی رۆنیسانس‌و لە بەرهەمی شانۆنامەنووسێکی وەک رابلێ‌دا دەرکەوتووە کە لە کۆمیدیا هەڵبەزدابەزەکانیدا بەچاوێکی تەوساوییەوە لەگەڵ بەستێنی جیددیی رووداوەکان و لەگەڵ دەنگی تاک و رەهاخوازی کەسایەتییەکاندا مامەڵە دەکات. ئەم جۆرە بۆچوونە و شێوە مامەڵەیەی بەرامبەر خود و ئەویدی لەیەکەم ژانری نەوڕسکی رۆماندا – واتە، رۆمانی عەیاری (Picaresque) – وە بەرچاو دەکەوێ. نموونەکان لێرەدا بریتین لە *دۆن کیشۆت*، بەرهەمی سێرڤانتێس لە سەرەتای سەدەی هەڤدە و *تام جۆنز* نووسینی هێنری فیلدینگ لە سەرەتای سەدەی هەژدەهەمدا کە هەر کامەیان، بەشێوەیەکی جیا رەخنە لە مرۆڤی ئەقڵانی و تاکڕەهەندی سەردەمی مۆدێرن دەگرن; هەڵبەت دیسانەوە ئەم رەخنەیە بەشێوەیەکی گاڵتەکارانە و بەچاوێکی تەوساوییەوە سەردەگرێ کە دەرئەنجامەکەشی ئازادی و پێکەنینە و، لە هەمان کاتیشدا هەندێ لایەنی دزێوی گوتاری باڵادەست دەخاتەڕوو. رۆمانی چەند دەنگی ئاکام و بەرهەمی ئەو نەریتەیە.

کەواتە، بەکورتی، کارناڤێلی چەرخەکانی ناوەڕاست دەگۆڕدرێ و دەبێتە کۆمیدیای هەڵبەزدابەزی رۆنیسانس و هەڵسوکەوتی کارناڤێلیانەی کەسایەتییەکی وەک ڤالستاف. ئەمانەش دەگۆڕدرێن و لە دەستپێکی سەردەمی مۆدێرندا، واتە لە سەرەتای سەدەی هەڤدەهەمدا، دەبن بەرۆمانی عەیارانە و، پاشان لە سەردەمی نۆزدەهەمدا رۆمانی چەند دەنگی داستایۆڤسکی سەرهەڵدەدات کە بۆ خۆی درێژەی هەمان رەوتە.



رۆمان بۆ باختین فۆڕمێکی دیالۆژیکە و ئەو ژانرە ئەدەبییەیە کە تایبەتمەندییەکی کراوەی هەیە و تێیدا، رێوراست وەک کارناڤێل، دەنگی دەسەڵاتدار بەهۆی ئامادەبوون و کاریگەریی دەنگەکانی ترەوە تووشی شڵەژان دەبێ و دەبێتە هاوسەنگی دەنگەکانی تر. هەر لێرەشدایە کە زمان بۆ خۆی رووبەڕووی پێناسەکردنەوەی سەر لە نوێ و بەردەوام دەبێتەوە، کە ئەمەش هاوکاتە لەگەڵ ململانێی چینە جیاجیاکان بەمەبەستی گرتنەدەستی دەسەڵات. بۆ نموونە، مانای وشەی «ئازادی» دەگۆڕدرێ و ئەم گۆڕانەش بەندە بەوەی کە کێ و کام لایەن پێناسەی دەکات، کەواتە بەرهەمەکانی باختین نەک هەر لە بەشێکن لە تیوری و رەخنەی ئەدەبی، بەڵکو تەنانەت رەهەندێکی سیاسیش دەگرنە خۆ. لێرەدایە کە دەق وەکو شوێنگەی ململانێی نێوان دەسەڵات و کولتووری جەماوەری لە قەڵەم دەدرێ.

کەواتە، کارناڤێل وەکو پێشینەی رۆمانی چەند دەنگی، ئەو شێوە تایبەتەی کولتووری جەماوەرییە کە دژی  کولتووری چینی باڵادەستە. باختین لەم بارەیەوە دەنووسێ:

> دەتوانین بڵێین– هەڵبەت بە مەرجی رەچاوکردنی هەندێ نموونەی تایبەت – مرۆڤی چەرخەکانی ناوەڕاست خاوەنی دوو ژیان بوو: یەکێکیان ژیانێکی رەسمی و جیددی و یەکدەست کە بەند بوو بەسیستەمی  جیددیی جیگە و پێگە کۆمەڵایەتییەکانەوە و ئەو ژیانە لە سێبەری دڵەڕاوکێ و ستەمکاری و سەرکوتکاریدا بوو و، ئەویدیکە ژیانی کارناڤێلی بوو و ئەمەش واتە ژیان بەسەربردن لە شوێنە گشتییەکاندا، ژیانێکی ئازاد و شاد و پڕ لە پێکەنین و بەبێ دڵەخورپێ بەهۆی پێشێل بوونی مرۆڤەوە. ئەم ژیانە دەیویست هەمە جۆرە بابەتێکی پیرۆز زەوینی بکاتەوە و گەرەکیبوو هەموو شتەکان بچووک بکاتەوە و، لە بیروڕا رەهاخوازەکان هەڵبێ. (ە. س.پ. ل.١٧٠)

پێکەنینی جەماوەر لە کارناڤێڵەکاندا رزگاربیەخشی ئەو مرۆڤانەیە لە کۆتوبەندی کولتووری رەسمی و جیددی و وشکی دەسەڵاتی دوور لە جەماوەر. دەنگی کارناڤێڵ لە راستیدا دەنگی جەماوەرە کە دەیەوێ بگاتە گوێی دیتران. لە کارناڤێڵدا هەموو شتێ پێچەوانە دەکرێتەوە: پاشا دەبێ بە گەمژە و گەمژە دەبێ بە پاشا؛ لە کارناڤێڵدا بیری ئایینی و بیری نائایینی تێکەڵی یەکتر دەبن؛ زانا و نەزان لە پاڵ یەکدان و لە ئەنجامدا جیهانێکی بەراوەژوو و پێچەوانە دەخوڵقێندرێ. بەم پێیەش، رەوتی زنجیرە قۆناغەکان لەناو دەچێ و بەرابەری و یەکسانی دێتەگۆڕێ. ئەم تایبەتمەندییانەی کارناڤێل، کە تێیاندا فرەچەشنی و جۆراوجۆری دەبیندرێ و مۆرکی سەرەکیی هەر هەمووشیان «فرەدەنگی»یە، لە رۆمانی چەند دەنگیدا بە سانایی وە بەرچاو دەکەوێ.

*برایانی کارمازۆف*، بەرهەمی داستایۆفسکی، لەم روانگەیەوە باشترین نموونەیە بۆ پیشاندانی رۆمانی چەند دەنگی. ئیڤان، دیمیتری و ئالێکس هەر سێکیان بران و هەر کامیان خاوەن روانین و هەڵسوکەوتی جیاوازی خۆیانن. ئالێکس (ئالیوشکا) مرۆڤێکی ئایینییە و دیمیتری مرۆڤێکی خۆش گوزەرانە و ئیڤان-یش مرۆڤێکی خاوەن هەڵسوکەوتی جیاوازی خۆیەتی کە لە کۆتایی رۆمانەکەدا تووشی نەخۆشیی دەروونی دەبێ.

لەسەرتاسەری رۆمانەکەدا دەنگی هەریەک لە براکان و شێوە ژیانیان و جیهانبینیی جیاوازیان بەشێوەیەکی هاوئاست و هاوتەریب ئاراستەی خوێنەر دەکرێ و، نەک هەر دەنگی یەکێکیان زاڵ نابێ بەسەر ئەوانی تردا، بەڵکو تەنانەت دەنگی خودی نووسەرەکەش، واتە داستایۆڤسکی، یاخود دەنگی باوکی ئەم سێ برایە و یاخود دەنگەکانی تر بەهیچ شێوەیەک بەسەر دەنگەکانی تردا زاڵ نابن. لێرەدا دەنگی



گێرەوەی چیرۆکەکە بۆ خۆی دەنگێکە لە نێو دەنگەکانی تردا. ئەم جۆرە هاوئاستی و یەکسانییەی نێوان دەنگە جیاوازەکانی نێو رۆمانەکەدا بەشێوەیەکە کە سەرنجی خوێنەر بەلای هیچ کامیاندا راناکێشرێ.

لە رۆمانی *ئاناکارنینای* تۆلستۆیدا، بەڵام، بەپێچەوانەوە، ئەمە دەنگی گێڕەوەکەیە کە بەسەر دەنگی کەسایەتییەکاندا زاڵدەبێ و هەم خوێنەر و هەم دانەری رۆمانەکەش بۆ چارەنووسی «ئانا» لەکۆتایی رۆمانەکەدا فرمێسک دەبارێنن. دانەر لەم رۆمانەدا خۆی بەخاوەنی کەسایەتییەکانی نێو بەرهەمەکەی دەزانێ, تەنانەت پێشی وایە لە چارەنووسی خراپی ئانادا بەشدار و تاوانبارە. ئەنجامی باسەکە بەم شێوەیە کە تۆلستۆی نموونەی ئەو نووسەرانەیە کە رۆمانی تاکدەنگی دەخوڵقێنن و داستایۆفسکی ئەو نووسەرەیە کە رۆمانی چەند دەنگی بەرهەم دەهێنێ. ئاشکراشە ئەم بیروڕایانەی باختین لەسەر رۆمانی تاکدەنگی و چەند دەنگی پێوەندیی راستەوخۆیان بە دیموکراسی و کراوەیی ئامادەی نێو بەرهەمی ئەدەبییەوە هەیە و، لەلایەکی دیکەشەوە، دژی دەسەڵاتی تاکدەنگ و تاک جەمسەرو تاکڕەهەندی رژێمی ستالینە. هەر بۆیەش لە دەقە جیاجیاکاندا بەلێشاو ئاماژە بۆ رەخنەی سیاسی باختین دەکرێ و، ئەمەش وەبیر ئەو بابەتەمان دەخاتەوە کە پێشتر وتمان: دەق شوێنگەی ململانێکانە.

باختین لە بەشێکی *پرسەکانی بوتیقای داستایۆڤسکی*دا دەستی داوەتە پۆلێنکاریی گوتار لە رۆماندا. دەیڤید لاج ئەم پۆلینکارییەی باختین بەم شێوەیە دەردەخا: گوتاری راستەوخۆی نووسەر، گوتاری نوێندراو و گوتاری دوو لایەنە (لاج٣٣: ١٩٩)، لێرەدا گوتاری یەکەم هەمان دەنگی گێڕەوەیە و گوتاری دووهەمیش وتوویژەکانی نێو

کەسایەتییەکان دەگرێتەوە، بەڵام هیچ کام لەم دوو گوتارە تایبەتمەندیی چەند دەنگییان نییە. لە روانگەی باختین- ەوە، هەر تەنیا گوتاری سێهەمە کە سەرنجڕاکێشە چونکە لە ڕێگەی گوتاری دوو لایەنەوەیە کە چەند دەنگی و چەند وشەیی لە بەرهەمدا دێتەدی.

باختین گوتاری سێهەم، واتە گوتاری دوو لایەنە، بەسەر چوار بەشدا دابەشدەکات کە بریتین لە: شێوازسازی (Stylization)، پارۆدی یان گاڵتەبەرهەم (Parody)، سکاز (Skaz) و مشتومڕی شاراوە ( Hidden Polemic). لە دوو جۆری یەکەمدا، واتە لە شێوازسازی و گاڵتەبەرهەمدا، نووسەر دەستدەکاتە لاساییکردنەوەی شێواز و بەرهەمێکی تایبەت، هەڵبەت بەم جیاوازییەوە کە لە شێوازسازیدا مەبەستی سەرەکیی شێوازسازی و جۆری تایبەتی ئەم شێوازە لەلایەن نووسەرەوە لەیەک ئاستدا دادەنرێن، بەڵام لە گاڵتەبەرهەمدا نووسەر کەڵک لە شێوازێک وەردەگرێ و هەندێ مەبەستی بەسەردا دادەسەپێنێ کە بەئاراستەی دژی مەبەستی شێوازە سەرەکییەکەدا دەڕوات. (ە.س.پ. ل.٣٦)

سکاز، لەلایەکی ترەوە، وشەیەکی رووسییە کە دەربڕی «ئەو رواڵەت و تەکنیکە گێڕانەوەییەیە کە گێڕانەوە سەرزارەکییەکان ئەنوێنێتەوە.» (هاتۆرن ١٣٣: ١٩٩٢) هەروەهاش، مشتومڕی شاراوە برێتییە لەو جۆرە گوتارەی تێیدا ئامادەبوونی ئەویدی هەستدەکرێ و لەراستیدا گوتارێکە لە وەڵامی گوتەی ئەویدیدا بیچمی گرتووە.

لێرەدا پێویستە پەنجە بخرێتە سەر جیاوازییەکانی دوو زاراوەی چەنددەنگی (Polyphonic) و چەندزمانی (Hetroglassia)، چونکە زۆرینەی خوێنەران و رەخنەگران بە شێوەیەکی یەکسان رووبەڕووی ئەم دوو زاراوەیەی باختین دەبنەوە. پۆلی گلاشیا یان هێتروگلاشیا ئەو



زاراوەیەیە کە باختین بۆ دەست نیشانکردنی ئامادەبوونی هاوکاتی دوو یان چەند زمانی میللی لە یەک سیستەمی کولتووریدا کەڵکی لێوەردەگرێ و، بەپێچەوانەشەوە، مۆنۆگلاشیا یان تاک زمانی دەربڕی ئەو تایبەتمەندییەیە کە بەرهەمێکی ئەدەبی لە نێو سیستەمێکی کولتووریی چەند زمانیدا لەوانەیە تەنیا لە یەک زمان کەڵک وەربگرێ. بەکارهێنانی ئەو زاراوەیە لەلایەن باختین-ەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستییەی کە لە سۆڤییەتی پێشوودا چەندین زمانی جیاواز لە ئارادا بوون و پرسی نووسینی ئەدەب بەزمانی رووسی یاخود زمانەکانی تر یەکێ لە پرسە هەرە گرنگەکانی ئەو ساتەوەختەی پێکدەهێنا. لێرەدا پێویستە بڵێین کە دەق لەوانەیە چەند زمانی بێ، بەڵام ئەمە مەرج نییە کە ئەو دەقە هاوکات چەند دەنگیش بێت. لە نێوان دوو زاراوەی چەند دەنگی و چەند زمانیدا باختین بایەخ بەزاراوەی چەند دەنگی دەدات و پێی وایە لەوانەیە دەقێکی چەند زمانی هاوکات دەقێکی تاک دەنگی بێ. لێرەدا تەنیا رواڵەتی زمانەکان گرنگ نین، بەڵکو ئەندێشە و جیهانبینیی پاڵپشتی زمانەکان گرنگە.

لەلایەکی ترەوە، بۆچوونی باختین بۆ زمان و بابەتی دیالۆژیک و بەرهەمی ئەدەبی، پێوەندیی زۆری بەچەمکی «نێوان دەقێتی»یەوە هەیە کە زیاتر لە لایەن ژولیا کریستاڤاوە پەرەی پێدراوە. لە پاڵ ئەمەشدا زاراوەی «دڵەڕاوکێی کاریگەرێتی» کە لەلایەن هارۆڵد بلووم-ەوە ئاراستەکراوە، پێوەندیی بە دیالۆژێزمی باختین-ەوە هەیە; ئەوەش جگە لەوەی کە گرنگیدانی باختین بەچەمکی «گوتار» دەمان خاتەوە بیر جۆرێک لە گرنگیدان بەم زاراوەیە لە خوێندنەوەکانی فۆکۆدا بۆ مێژوو و کۆمەڵناسی.

**٢. هۆی وەرگێڕانی ئەم کتێبە:**

ئەو بابەتانەی لەم پێشەکییە کورتەدا ئاماژەمان بۆ کرد کەمتر لەم کتێبەی بەردەستدا باسیان لێوە کراوە. ئەم کتێبە لەراستیدا بەمەبەستی ئاشناکردنی خوێنەری کورد بە شێوەی لۆژیک و بەڵگاندن و شێوازی نووسینی باختین وەرگێڕدراوەتەوە. لەلایەکی تریشەوە، لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا خوێنەر رووبەڕووی کۆمەڵێ وتاری ناسراوی هەندێ رەخنەگر و تیۆریدارێژی سەدەی بیستەم دەبێتەوە (وەک تۆدۆرۆڤ، یاکوبسن، گۆڵدمەن و... ) کە لە سەر باختین و ئەندێشە وکاریگەرێتی و بەرهەمەکانی نووسراون. ئەم کتێبە لە زمانی فارسییەوە کراوە بەکوردی و هەڵبژاردن و وەرگێڕانی بابەتەکان بۆ سەر زمانی فارسی لە لایەن بیرمەند و وەرگێڕی ئازاو ناسراوی کۆچکردوو، محەمەد جەعفەر پوویەندە، بە ئەنجام گەیشتووە و ئێمە دوو بەشی کۆتایی ئەم بەرهەمەمان، کە تێکڕا شەش لاپەڕە بوو، بەپێویست نەزانی وەربگێڕینەوە سەر کوردی.

ئەگەرچی باشتر وایە کتێبێکی لەم چەشنە لە زمانی یەکەمەوە وەربگێڕدرێتەوەو ئێمەش زیاتر لە زمانی یەکەمەوە بابەت ئەکەینە کوردی، بەڵام لە وەرگێڕانی ئەم کتێبەدا دوو مەبەستی سەرەکیمان هەبوو. یەکەم ئەوەی کە بەشی یەکەمی ئەم کتێبە لە کۆمەڵێ وتاری بەنێوبانگی چەند تیۆریدارێژێکی گەورەی سەدەی بیستەم پێکهاتووە کە لەسەر باختین نووسیویانە و هەر کامەیان لە بەرهەمێکی جیاوازدا چاپکراون و لێرەدا لە دووتوێ یەک کتێبدا رووبەڕووی هەموویان دەبینەوە. دووهەم ئەوەی کە گواستنەوەی هەندێ شێوازی تایبەتی زمانی فارسی – چ لەڕووی بنەمای رستەکان و چ لەڕووی جۆری وشەکانەوە – بۆ سەر زمانی کوردی بە ئەرکێکی پێویست دەزانم.



هەرچەند ئەزموونی نەک درێژی وەرگێرانی من ئەوەی بۆ دەرخستووم کە لە زۆربەی کاتەکاندا وەرگێڕی کورد دەتوانێ زاراوە بیانییەکان لە زمانی یەکەمەوە ئاسانتر و رەسەنتر بۆ سەر کوردی وەربگێڕێتەوە، بەڵام پێم وایە گواستنەوەی هەندێ شێوازی دەقی فارسی–چ لە نووسین یان دەقی وەرگێڕدراو–بۆ زمانی کوردی دەتوانێ دەورێکی سوودبەخش بگێڕێ.

**٣. بەراوردکارییەکی خێرای زمانی فارسی و کوردی**
**لە رووی ئاستی گەشەسەندنەوە:**

گەرچی زمانی فارسی و کوردی هەردووکیان لە یەک بنەماڵەی زمانەوانیدان، بەڵام حاشاهەڵنەگرە کە زمانی فارسی چ لە باری میراتی کلاسیکی پەخشانی ئەدەبی و هونەری‌و فیکرییەوە و چ لەڕووی شێوازە جیاجیا زانستی و مەعریفییەکانەوە وبەتایبەت ئەو دەقە زانستی و مەعریفییە نووسراوو وەرگێڕدراوانەی سەدەی بیستەمەوە گەلەک زیاتر لە زمانی کوردی گەشەی کردووە و، ئاستی ئەم گەشەکردنەی زمانی فارسیش، بەتایبەت لە رووی وەرگێڕانی دەقە تیۆریکەکانەوە، بەشێوەیەکە کە زۆرجار بەراوردکردنی ئەم دوو زمانە پێکەوە کارێکی بێ کەڵکە.

بەراوردکردنێکی خێرای دەقە فەلسەفی‌و تیۆریکەکانی سەرەتاو ناوەڕاست‌وکۆتایی سەدەی بیستەم لە کتێبخانەی فارسیدا ئەو راستییەمان بۆ دەخاتە بەرچاو کە زمانی فارسی لە سەدەی بیستەمدا بە شێوەیەکی دیارو تەنانەت سەیرو سەمەرە گۆرانکاریی بە سەردا هاتووە. بۆ نموونە، بە سەرنجدان لە زمانی بەکارهێنراو لە وەرگێرانەکانی محەمەد عەلی فرووغی لە بەرهەمەکانی دیکارت لە

سەرەتای سەدەی بیستەم و وەرگێڕانەکانی حەمید عەنایەت لە هێگل لە ناوەڕاستی سەدە و وەرگێڕانەکانی حسێن بەشیریە لە توماس هابز و عەبدولکەریم رەشیدیان لە کانت و داریووش ئاشووری لە نیچە و موراد فەرهادپوور لە ئادۆرنۆ و حسێن پایەندە لە تیوریی ئەدەبی و زۆر وەرگێڕی‌تر لە کۆتایی هەمان سەدە- لە رووی جۆری وشەکان، بنەمای رستەکان، ژمارەی زاراوە نوێ‌ولاتینییەکان یان زاراوە کۆن‌وعەرەبییەکان و هەروەها کورتی‌ودرێژیی لارستەکان، شوێنی ئاوەڵکردارەکان، هێنان یان لابردنی ئاوەڵناوەکان و تەنانەت رەچاوکردن یان نەکردنی خاڵبەندی‌و پەرەگرافبەندی- ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ئەو وەرگێڕە ئاماژەبۆکراوانە توانیویانە تا رادەیەکی زۆر بەرچاو زمانی فارسی بە تایبەت لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ دەقە فەلسەفی‌وتیوریکەکانی رۆژئاوادا بخەملێنن و دەوری سەرەکی بگێڕن لە بەرەوپێشبردنی زمانی فارسی و ئامادەکردنی ئەو زمانە بۆ بەکارهێنان و لەخۆگرتن و پەرپێدان و داهێنانی ئەندێشەو بیرو بیرۆکەی فیکری‌ورەخنەیی‌و تیوریک.

پرسی پێشڤەچوون‌و گەشەسەندنی زمان(development of (language یەکێکە لە بابەتە گرنگەکانی گوتاری ئاکادیمیکی هاوچەرخ. دەوری چارەنووسسازی زمان بە گشتی و کاریگەریی زمانناسیی پاش‌سوسووری لە بەشە جیاجیاکانی زانستە مرۆییەکان و سەرهەڵدانی ئەو لقوپۆپە زۆرەی زمانناسیی هاوچەرخ لە لایەکەوەو، تایبەتمەندییە جەوهەری‌وشێوەییەکان و سیمای هەنووکەیی زمانی کوردی لە لایەکی ترەوە ناچارمان دەکەن زیاترو وردتر لە جاران سەرنج بدەینە پرسی گەشەسەندنی زمانی کوردی. هەروەهاش، ئەو گۆڕانکارییانەی لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوەو بە هۆی سەرهەڵدانی



رۆژنامەوانیی کوردییەوە بەسەریدا هاتووە تا دەگاتە زمانی نوێی شیعری گۆران و زمانی چیرۆکنووسیی نیوسەدەی رابردوو و زمانی دەقە نووسراوەو وەرگێردراوەکانی لێکۆڵینەوە جیاجیاکان و بەم دواییانەش زمانی بەکارهێنراو لە چەتی ئینتێرنێتی یان پەیامی مۆبایل‌وسەرشاشەی تێلیڤزیۆنەکان دەلالەت لە جۆرێ گۆڕانکاری لە زمانی کوردیدا دەکەن. هەندێ لەم زمانانە و زۆرێک زمانی‌تری بەکارهێنراو لە بەستێنە جیاجیاکاندا زۆربەی کاتەکان رووبەڕووی جۆرێ سەرسامی، درەنگ تێگەیشتن، چەوت تێگەیشتن یان هەر تێنەگەیشتن، یان هەستکردن بە دیاردەیەکی تازەمان دەکەنەوە. جیا لەمەش، دابڕانی زمانی نووسەران لە یەکتر و بەدیهاتنی جۆرێ پاشاگەردانی لە شێوەی بەکارهێنانی زاراوەکان لە نووسیندا و، ساکارکردنەوەی بابەتەکان، کورتکردنەوەی رستەکان، لابردنی ئاوەڵکردارو پشتگوێ‌خستنی ئاوەڵناوەکان و رەچاو نەکردنی دەوری رێزمانیی پاشگرو پێشگرەکانی زمانی کوردی و بە گشتی وەفادارنەبوون بە شکڵ‌وشێوەی دەقەکان لە وەرگێڕانەکاندا بۆتە هۆی سڕینەوەی متمانە لە ژمارەیەکی زۆری نووسەرو وەرگێڕی کورد.

زمانی فارسی، لە لایەکی‌ترەوە، لە ماوەی سی چڵ ساڵی رابردوودا گەلەک پێشکەوتنی بە خۆیەوە بینیوە. چ شێوازی زمانی رۆژنامەکانی ئێستاو چ زمانی دەقە بەرهەمهاتووەکانی ئاقاری فیکر و تیوری و بەراوردیان لەگەڵ زمانی تەنانەت حەفتاکانی زایینیدا ئەو راستییەمان بۆ دەئەخەن کە زمانی فارسی لە ماوەی ئاماژەبۆکراودا بە شێوەیەگەلی ئۆرگانیک، یان دامەزراوەیی و تا رادەیەکیش یەکدەست گەشەی کردووە. بەڵام، ئەو گۆڕانکارییانەی زمانی کوردی، گەر وەکو گۆڕانکارییان لە قەڵەم بدەین، تا چ ئاستێک توانیویانە زمانی کوردی بۆ

رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بابەت و بارودۆخە جیاجیاکاندا ئامادە بکەن؟ ئاخۆ ئەو جیاوازیانەی نێوان شێوەی بەکارهێنانی زمانی فارسیی ئێستا و پێش سی ساڵ لە بەرهەمەکانی، بۆ نموونە، حەمید عەنایەت وعێزەتولا فوولادوەند کە تەنانەت تا رادەیەکیش لە سەریەک بابەت کۆمەڵێ دەقیان وەرگێڕاوەتەوە سەر فارسی، لە نێوان زمانی کوردیی ئێستا و سی ساڵ لەمەوبەردا دەبیندرێ؟ ئایا ئێمە بۆ وەرگێڕانی دەقە ئارکەیک و کۆنەکان خاوەن چ زمانێکین؟ بە گشتی، بە چ شێوەیەک رووبەڕووی پرسی گەشەسەندنی زمانی کوردی بینەوە؟ حەز دەکەم ئەو خاڵەش وەبیر خوێنەر بهێنمەوە کە ئەم پرسیارانە پێوەندیی راستەوخۆیان بە کۆمەڵێ پرسیاری ترەوە هەیە کە لە ماوەی ئەم چەند ساڵەدا دەربارەی پێوەندیی نێوان کورد و مۆدێرنیتێ ئاراستەمان کردووە. یەکێ لە سەرچاوە سوودبەخشەکانی وڵامدانەوەی پرسیاری« زمانی کوردی لە باری گەشەسەندنەوە لە چ ئاستێکدایە؟» ئەگەڕێتەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەم پرسیارە کە «پێوەندیی نێوان کورد و مۆدێرنیتێ لە چ ئاستێکدایە و بە چ شێوەیەکە؟» لێکۆڵینەوە لەم باسە بابەتی ئەم پێشەکییە کورتەی بەردەست نییەو بەجێئەهێڵین بۆ نووسینێکی تر؛ هەڵبەت وەکو ناساندنی سەرچاوە بۆ ئەم باسە، بە تایبەت دەربارەی چۆنیەتی بەدیارکەوتنی نیشانەکانی مۆدێرنیتێ لە نێو کوردان لە رووی سەرهەڵدانی چاپەمەنی و پەخشانەوە، سەرنجی خوێنەر بۆ بەشی چوارەمی کتێبی *از رمان تا ملت* رادەکێشم کە تێزی دوکتورای هاشم ئەحمەدزادەیە و بە ئینگلیسی نووسراوەو لە لایەن نووسەری ئەم دێڕانەوە کراوە بە فارسیو بەم زووانە چاپ دەکرێ.



## ٤. سووکە ئاوڕێک لەسەر وەرگێڕانی دەقی تیوریک بۆ کوردی:

### ئەلف. بنەمای رستە و شێوازی دەق:

لەم کتێبەدا زۆرجار بە ئەنقەست هەوڵمداوە بنەمای رستەکان هەر بەهەمان شێوە وەربگێڕمەوە سەر کوردی. ئەمەش پێچەوانەی روانگەی زۆربەی وەرگێڕانی کوردە کەهێشتا پێیان وایە رستەکان پێویستە وەک رووبارەکانی کوردستان رەوان بن. رەوانبوونی رستەکان زیاتر لە دەقە مێژوویی و گێڕانەوەیی و رۆژنامەنووسانەکاندا رەوایە و لە دەقێکی تیوریک و فەلسەفی و سەر بەهەندێ رێبازی مەعریفەناسانەدا رستەکان نەک هەر رەوان نین، بەڵکو لە جەوهەردا زۆر وردەکارانە و هەندێ جاریش بەهۆی زاراوەکانەوە ئاڵۆز دەنوێنن و لێرەدا خوێندنەوەی چەند جارەکی رستەیەک بابەتێکی ئاساییە. بابەتی چۆنیەتی شێواز, بەتایبەت بنەمای رستەکان، ئەو بابەتە گرفتسازەی مەیدانی نووسینی کوردییە کە لەلایەکەوە زۆربەی نووسەرانی دەقە مێژوویی و گێڕانەوەیی و بەڵگەیی و رۆژنامەنووسانە و سیاسی و ئایدۆلۆژیکەکان پشت گوێ دەخەن و هەندێ جار بە ڕق و نفرین یاخود بە لاتاوو تیزوتوانجەوە رووبەڕووی دەبنەوەو، لەلایەکی تریشەوە، زۆربەی وەرگێڕانی ئەم جۆرە دەقە تیوریک و فەلسەفی و مەعریفیانە لەبەر هۆکاری جیاجیا نەیان توانیوە ئەرکی خۆیان بەشێوەیەکی جیدی و بەهەستیارییەوە بەجێ بهێنن و ئێمە پێشتر لە نووسینێکدا بە بەڵگەوە ئەوەمان خستۆتەروو کە زۆربەی نووسەران و وەرگێڕانی کوردی ئاقاری مەعریفە و فیکر خاوەنی هۆشیاریی زمانناسانە نین. یەکێک لە دەرئەنجامەکانی نەبوونی ئەم جۆرە هۆشیارییە ساکارکردنەوەی

شێوازی دەقە ئەسڵییەکانە. بە واتایەکی روونتر، وەرگێڕی کورد زۆربەی کات دەست دەکاتە ساکارکردنەوەی شێوازی ئەو دەقەی وەری دەگێڕێتەوە بۆ سەر کوردی، ئەمەش دیسانەوە پەرە بە زەینییەتی ساکارسازانەی ئێمە دەدات (ساکارکردنەوەو هەندێ کردەوەیتر بەشێکن لە تایبەتمەندییەکانی سەلەفیەت کە لە وتارێکیتردا پێناسەم کردووە).

زمانی کوردی لە باری چۆنیەتی بنەمای رستەکانەوە بە زمانێکی بازنەیی، واتە Periodic ، دادەنرێ. پێناسەی زمانە بازنەییەکان زۆر سادەیە و ئەو زمانانە دەگرێتەوە کە تێیاندا کرداری سەرەکیی رستەکە لە کۆتایی رستەکەدا دەردەکەوێ. لە زمانی بازنەییدا (واتە Periodic) رستەکان بەشێوەیەکی سروشتی و بەهۆی تێگەیشتن لەکۆی مانای رستەکە کورتن؛ هەر بۆیەش لە زمانێکی وەک زمانی کوردیدا ناکرێ و ناتوانرێ رستە لاوەکییەکان و دەستەواژەکان ولارستەکان بەشێوەی زمانە نابازنەییەکان (non-periodic) بەکاربهێنرێن. لە رستەیەکی زمانی کوردیدا زۆرجار بەئاستەم دەتوانرێ دوو یان سێ رستەی لاوەکی بەکاربهێنرێ و، ئەمەش رێوڕاست ئەو تایبەتمەندییەیە کە لە دەقە تیۆریکەکاندا هەیە. بەواتایەکی تر، بنەمای رستەکانی دەقێکی تیۆریک - بەهۆی سنووردارتر کردنەوە و تایبەتیکردنەوەی بابەتەکەوە لە چەندین رستە و لارستەی لاوەکی و ناوەکی پێکهاتووە. وەرگێڕانی ئەم جۆرە رستانەی دەقە تیۆریکەکانی زمانە رۆژئاواییەکان - کە زۆربەیان زمانی نابازنەیین - بۆ سەر زمانی کوردی کە زمانێکی بازنەییە کارێکی سەخت و دژوارە. هەر بۆیە هەندێ جار وەرگێڕی کورد ناچارە رستەکە بەسەر دوو یان سێ رستەی بچووکتردا دابەشبکات وئەگەرچی ئەمەش جۆرێکە لە دەست تێوەردان لە شێوازی رەسەنی



دەقەکە، بەڵام ئێمە هەندێ جار رەچاوکردنی ئەم بنەواشەیە بە رەوا دەزانین.

لەلایەکی ترەوە، بەلێشاو بەکارهێنانی ئاوەڵکردار بەتایبەت ئاوەڵکرداری تایبەت بە تایبەتیکردنەوەی مانای ئاوەڵناو  تایبەتمەندیی سەرەکیی بنەمای رستەکانی دەقە تیۆریکەکان پێکدەهێنێ. ئەم خەسڵەتەی دەقی تیۆریکی زمانە رۆژئاواییەکان زۆر بەدەگمەن لە زمانی کوردیدا هەست پێدەکرێ. لە زمانی کوردیدا ئەگەر بمانەوێ مانایەکی تایبەتیتر لە رێگەی ئاوەڵکردارەوە ببەخشینە ئاوەڵناوەکان، ئەوا لەرێگەی لارستەیەکەوە ئەم کارە دەکەین. ئەگەر وەکو بنەمای رەسەنی دەقەکە ئەم کارە لەرێگەی کردارەوە ئەنجامبدەین، ئەوا نووسینەکەمان بەهۆی خەسڵەتی بازنەیی خۆیەوە مانایەکی ئاڵۆز دەبەخشێتە رستەکە کە زۆربەی کات ئەم مانایەش بەهۆی درێژیی رستەکەوە، لەبەر ئەوەی کە کرداری سەرەکیی رستە لە زمانی کوردیدا لە کۆتایی رستەکەدا دەنووسرێتەوە، رواڵەتێکی ئاڵۆز و فامنەکراو لە خۆ دەگرێ.

سەرەڕای ئەو تایبەتمەندییانەی زمانی کوردی، ئێمە دژی ساکارکردنەوەی شێوازی دەقە تیۆریکەکانین و، ساکار کردنەوەش ئەو رەوتەیە کە رۆژانە و لە بەرهەمە جیاجیاکاندا و لە گۆڤار و رۆژنامەکاندا رووبەڕووی دەبینەوە. ئێمە پێمان وایە شێوازی سادەی نووسین زەینییەتی خوێنەر بەشێوەیەکی ساکار دادەهێنێ و خەسڵەتی سادە ئەندێشەیی دەبەخشێتە ئەو زەینییەتە (هەڵبەت لێرەدا نامەوێ وەک تیۆدۆر ئادۆرنۆ زۆر رادیکاڵ رووبەڕووی ئەم پرسە ببمەوە و بڵێم شێوازی سادەی نووسینی دەقە فەلسەفی و تیۆریکەکان خوێنەر دەکا بە فاشیست). بەڵام با ئەوەش لە بیر نەکەین کە گەلەک هۆکاری

تری فەلسەفی لە پشت رەتکردنەوەی رستە کورت و حوکمە گشتییەکانەوەیە کە ئێرە جێگەی باسکردنیان نییە (باختین لە بەشێک لەم کتێبەی بەردەستدا بە بەڵگاندنەوە دژایەتی خۆی لەگەڵ رستەو حوکمە گشتییەکاندا دەربڕیوە).

**بێ. وشەو زاراوەکان:**

وەرگێڕانی دەقی تیۆرێک بۆ سەر زمانی کوردی نەک هەر لە باری بنەمای رستە و شێوازی دەقەوە بەڵکو لەڕووی چۆنیەتی وشەکان و زاراوەکانیەوە دیسانەوە یەکێکی تر لە کەڵکەڵە سەرەکییەکانی وەرگێڕی کورد لە ئاقاری مەعریفەناسی و تیۆریدا پێکدەهێنێ. دیسانەوەش ئەم بابەتە لەلایەن هەندێ نووسەر و وەرگێڕی دەقی مێژوویی ، بەڵگەیی، رۆژنامەنووسانە، سیاسی و ئایدۆلۆژیکەوە بۆتە بابەتی «حەرام»و ئەوەی کە هەر بەگرنگی نازانن و ئاوڕی لێنادەنەوە هەر هیچ، وەرگێڕی دەقە تیوریکەکەش سەرکوت دەکەن کە گوایە زمانی کوردیی تێکداوە وکۆمەڵێ وشە و زاراوەی ناحەز و رەق و تەق و بێ مانای هێناوەتە نێو زمانی کوردییەوە.

ئێمە پێشتر لە چەندین نووسیندا وهەروەهاش بەکورتی لە پێشەکیی *فەرهەنگی زاراوەی ئەدەبی*دا، چاپی دەزگای سەردەم، ئاماژەمان بۆ گرنگایەتی و بایەخی وشەرۆنان و زاراوەسازیی کردووە. لە راستیدا ئەرکێکی وەها دەکەوێتە ئەستۆی کۆڕی زانیاری کورد، بەڵام ئێمە هەر هەموومان ئاگامان لەوەیە کە ئەندامانی کۆڕ قەت خوێندنەوەی دەقە فەلسەفی وتیوریکەکانیان بەلاوە گرنگ نەبووە و هێشتا پێیان وایە زمان لە مەعریفە جیایە و، بۆ وان سوسوور هێشتا لە دایک نەبووە. ئەوان زمان تەنیا بۆ رێنووس و رێزمان و دەنگناسی و مێژوو



دادەبەزێنن و زیاتر هەوڵی نووسین و وەرگێڕانی دەقە ئەدەبییە کلاسیک و یاخود شێوازە ریالیستییەکان دەدەن. هەر بۆیەش نەک هەر لە کۆڕداو بەڵکو لە کتێبخانەی کوردیدا بەردەوام بەرهەمەکانی گۆرکی و بوزورگ عەلەوەی و ئەحمەد مەحموود و محەمەد قازی (زیاتر کتێبە مێژووییەکانی) وەردەگێڕدێنەوە سەر کوردی، بەڵام بەدەگمەن چاومان بە وەرگێڕانی بەرهەمێکی، بۆ نموونە، جۆیس، فاکنێر،گولشیری یان قوتابخانەی فرانکفۆرت دەکەوێ. دەستەی یەکەم ئەو بەرهەمە ئەدەبی و مێژووییانەن کە تێیاندا رستەکان کورتن و شێوازەکەش ریالیستییە و وەرگێڕ لەواندا پێویستی بەتەرخانکردنی کات و ئەندێشە بۆ چۆنیەتی وەرگێڕانی وشە نوێکان نییە. بەڵام لە دەستەی دووهەمدا چاومان بەو بەرهەمە ئەدەبی و فەلسەفییانە دەکەوێ کە تێیاندا بنەمای رستەکان ئاڵۆزە و شێوازەکەش سادە و ساکار نییە و وەرگێڕ لەواندا پێویستە کات و ئەندێشەی خۆی تەرخان بکات بۆ وشەرۆنان و زاراوەسازی، ئەویش بەشێوەیەک کە نەکەوێتە بەر رق و نفرین و گاڵتەی وەرگێڕانی دەستەی یەکەم.!

رەوتی وەرگێڕانی دەقە مێژوویی، بەڵگەیی، رۆژنامەنووسانە و ریالیستیکەکان بە سادەترین جۆری وەرگێڕان دادەنرێ و تێیدا وەرگێڕ زۆر بەدەگمەن رووبەڕووی گرفتێکی زمانناسانە دەبێتەوە. وەرگێڕانی دەقی مێژوویی سادەیە و زەحمەتێکی ئەوتۆی ناوێ. ئەگەرچی ئەم جۆرە وەرگێڕانە، واتە وەرگێڕانی دەقی مێژوویی، رۆژنامەنووسانە، بەسەرهات، سەربوردە، بەڵگەنامەوژیاننامە بۆ پەرەپێدانی زانیاریی گشتیو پڕکردنەوەی ئەرشیڤەکان یان هەر مەبەستێکیتر گەلەک سوودبەخشە، بەڵام نابێ لە بیرمان بچێتەوە کە ئەم جۆرە وەرگێڕانانە تا رادەیەکی زۆر لە خزمەتی بەرەوپێشچوونی زمانی کوردیدا نین.

ئەگەرچی وەرگێڕانی دەقە ریالیستییەکانیش تا رادەیەک هەر لەم خانەیەدان، بەڵام پێویستە ئەوەش بڵێین کە وەرگێڕانی راستەقینەی «لەحن»ی گوتەی کەسایەتییەکان لە بەرهەمە ریالیستییەکانیشدا دیسانەوە کۆمەڵێ گرفت رووبەڕووی وەرگێڕی کورد دەکاتەوە چونکە یەکێکی تر لە کەم وکوڕییەکانی زمانی ئەدەبیی کوردی بریتییە لە رەچاونەکردن و گرنگینەدان بەچۆنیەتی وەرگێڕانی «لەحن». بۆ نموونە، لەوانەیە لەحنی دەقێکی ئەدەبی، تەوساوی (Ironic) بێ کەچی خوێنەری کورد بەهۆی لاوازبوونی لەحنی تەوساوی لە دەقە کوردییەکاندا زۆر بەدەگمەن هەستی پێدەکات و زۆربەی کاتیش خوێنەری دەقێکی وەرگێڕدراوی ئەدەبی (زیاتر چیرۆکو رۆمان) قەت ئاگای لەوە نییە کە بەشێک لە وەسفەکانو دەربڕینەکانو گوتەکان رواڵەتێکی تەوساوییان هەیە نەک رواڵەتێکی حەقیقی وراستەقینە، کەچی خوێنەری کورد پرۆسەی خوێندنی چیرۆکەکە تەواو دەکاتو قەد ئاگاشی لەوە نییە کە لەحنی بەشێ لەو شتانەی خوێندوویەتیەوە تەساوی بووەو رەنگە نووسەرەکە بە گاڵتەوە کۆمەڵێ شتی باسکردبێ و ئەم بە جیددی وەری گرتوون.

سەرەڕای ئەو وتانەی سەرەوە، من پێموایە زمانی کوردی لەسەرجەم قۆناغە جیاجیاکانی گەشەکردنی خۆیدا ئەوەندەی ئەم بیست ساڵەی رابردوو لە باری وشە و زاراوە و تەنانەت بنەماو شێوازەوە گەشەی بە خۆیەوە نەبینیوە. هەڵبەت لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا و لەسەر دەستی کۆمەڵێ نووسەر و وەرگێڕ گەلێک زاراوەی نوێ هێنرانە نێو زمانی کوردییەوە، بەڵام با دیسانەوەش لە بیرمان نەچێتەوە کە ئێمە مەبەستمان زاراوە ئاساییەکان نییە، بەڵکو مەبەستمان زاراوە تیوریک و مەعریفەناسانەکانە. بەداخەوەش لەم



رووەوە هێشتا کەموکوڕییەکان هەر زۆرن و بەو هیوایە رۆژێک لە رۆژان شێوازە جیاجیا زانستی و فەلسەفی و تیوریکەکان لە زمانی کوردیدا هێندە پاراو و رەوان ببنەوە کە نووسەرانی سەلەفیی دیسانەوە وەبیر شەپۆلی رەوان و سادە و ساکاری رووبارەکانی کوردستان و شێوازی بەلاغیی دەقە کلاسیکەکان بخەنەوە.

ئەرکی ئێمە خەملاندنی زمانی کوردییە لەڕووی سەقامگیری وشە نوێکانەوە؛ ئەرکی ئێمە مسۆگەرکردنی تایبەتمەندییە جیاجیاکانی شێوازە جیاجیاکانە لە زمانی کوردیدا؛ ئەرکی ئێمە مەلەکردن نییە لە رووبارە رەواکانی سروشتی پاک و بێگەردی کوردستاندا، ئەرکی ئێمە خۆ دەربازکردنە لە دەریایەکی پڕ شەپۆلی ترسناک کە گەلێک تۆفان و زریانی تێدایە.

وشي بۆ ئێمە گرنگە. بە هەستیارییەوە بەکاری ئەهێنین. ئێمە، جۆیس گوتەنی، لە نێو وشەکاندا ژیان ئەبەینە سەر. بۆچوونی ئێمە بۆ دەوری وشە کاتێ گرنگتر ئەنوێنێ کە سەرنج بدەینە ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییانەی لەئارادان. بایەخی وشە کاتێ زیاتر دەرئەکەوێ کە باسی «گەشەسەندنی زمان» ئەکەین.

ئەگەرچی لە وەرگێڕاندا، جگە لە واشە، زۆر بابەتی تر وەکو بنەمای رستە و فۆرم و لەحن و شێواز و واتاناسی و ماناناسی دەوریان هەیە، بەڵام رووبەڕووبوونەوەی وشە وەکو یەکەمین پلەی وەرگێڕان دادەنرێ و لە راستیشدا گرنگترین پلەیە چونکە وەکو بنەڕەتێک بۆ دەستپێکردنی وەرگێڕان وایە. ئەم بنەڕەتە لە وەرگێڕانی دەقی تیوریک و فیکری بۆ سەر زمانی کوردی لە گۆڕێدا نییە چونکە هەر زاراوەیەو بە چەشنێک لە دەقە جیاجیاکاندا وەرگێڕدراوەتەوە. ئەم جۆرە پشتگوێ خستنەی زاراوەکان و خۆگێلکردن لە وەرگێڕانیان یان بە هەڵە بە

کارهێنانیان لە راستیدا پشتگوێ خستنی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانە. ئەم تاقمە نووسەر و وەرگێڕانە، هەر وەک لە وتارێکیتردا وتوومە، خاوەنی هۆشیارێی زماننانسانە نین. ئەم جۆرە نووسەر و وەرگێڕانە نەک هەر دەوریان لە پێشکەوتنی زمانی کوردیدا نەبینیوە، بەڵکو هەر بیریشیان لێ نەکردۆتەوە و سەیر لەوەدایە کە بۆخۆشیان دەوری سەرەکییان لە شێواندنی دۆخەکەدا گێڕاوە.

پێم وایە باشترین وتراو دەربارەی گرنگایەتی وشەکان و دەوریان لە گۆڕانکارییەکاندا بەتایبەت لەم هەلومەرجەی ئێستای کۆمەڵگای کوردیدا ئەو بەشەی گوتەکانی باختینە کە هەر لەم کتێبەی بەردەست قۆزتوومەتەوە:

> وشەکان بە تانوپۆی ئایدیۆلۆژیکەوە چێنراون کە هاوکات تانوپۆی سەرجەم پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە هەموو بەستێنە جیاجیاکاندا پێکدەهێنن. کەواتە ئاشکرایە وشە هەستپێکراوترین نیشانەی سەرجەم گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانە، تەنانەت ئەو گۆڕانکارییانەش کە تازە خەریکی پەرەسەندن، ئەو گۆڕانکارییانەی کە هێشتا بەتەواوی بیچمیان نەگرتووە و هێشتا ڕێگەی سیستەمە ئایدیۆلۆژیک و بنەمادار و پێکهاتەمەند و تەواو بیچمگرتووەکانیان بەتەواوی هەموار نەکردووە. وشە لێرەدا رووبەرێک پێکدەهێنێ کە شوێنگەی کۆبوونەوەی چەندایەتی و هێمنی ئەو گۆڕانکارییانەیە کە هێشتا نە دەرفەتی وەدەستهێنانی چۆنایەتییەکی ئایدیۆلۆژیکی تازەیان هەیە, نەک دەرفەتی بنیاتنانی شێوەیەکی ئایدیۆلۆژیکی تازە و کامڵ. وشە دەتوانێ بچووکترین و ناهێمنترین قۆناغەکانی تێپەڕین لە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان تۆماربکات.



لە کۆتاییدا بەپێویستی دەزانم کە سوپاسی خۆم ئاراستەی نووسەرو وەرگێڕی بەتوانا، مەنسوور تەیفووری، بکەم کە هاندەرم بوو لە چاپکردنی ئەم کتێبەدا چونکە وەک لە دەستپێکی ئەم پێشەکییەدا ئاماژەم بۆ کرد، وەرگێڕانی ئەم کتێبە چەندین ساڵ لەمەوبەر تەواوبوو و، ئەرکی ئامادەکردنی بۆ چاپ لە ئەستۆی ئەم هاوڕێیەدا دابوو.

هەروەهاش، هیوادارم کتێبخانەی کوردی بەم زووانە وەرگێڕانی چەندین بەرهەمی میخاییل باختین بەخۆیەوە ببینێ.

**بەختیار سەجادی**

**سنە، زستانی ١٣٨٤ی هەتاوی- ٢٠٠٦ی زایینی**

## (۱)
## باختین: گەورەترین تیۆری داڕێژی ئەدەب لە سەدەی بیستەمدا

**تێزڤیتان تۆدۆرۆف**

ڕەنگە بکرێ بەبێ شک و گومانێکی زۆرەوە دوو ئاوەڵناوی پڕ بەپێست بۆ میخاییل باختین دابنرێ و بوترێ کە گرنگترین هزرڤانی سۆڤیەت لە بەستێنی زانستە مرۆییەکان و مەزنترین تیۆری داڕێژی ئەدەب لە سەدەی بیستەمدایە. هەڵبەت لە نێوان ئەم دوو ئاوەڵناوە بەرچاوەدا چەشنێ هاوتەبایی و پێوەندیی لە ئارادایە: نەک بەم مانایە کە بەمەبەستی گەشەکردن و نێوبانگ دەرکردن لە بەستێنی رارێژیی ئەدەبیدا مرۆڤ دەبێ خەڵکی سۆڤیەت بێ (گەرچی نەریتی رووسی، تاڕادەیەک، لە نەریتی هەر وڵاتێکی تر دەوڵەمەندترە)؛ بەڵکو لەم رووەوە کە – ئەگەر ئەم لێکدانەوەیە رەوابێ– زانستە مرۆییەکان سەرەتا لە نەبوونی پسپۆڕیی تیۆریکدا گەشەی کردو، لەلایەکی تریشەوە، سەرنجدان بەئەدەب (رەنگە ئەمەیان زیاتر رەوا بێ) بۆ پسپۆڕانی زانستە مرۆییەکان پێویستە.

باختین شایەت و دەرکەوتەی پڕ بە پێستی ئەم بابەتەیە. باختین بەر لە هەر شتێ تیۆری داڕێژی دەقە (دەق بە مانایەکی بێ سنوور،



واتە بەربڵاوتر لە دەقی ئەدەبی). کەواتە بەمەبەستی زۆرتر پێشڤەبردنی توێژینەوەکانی خۆی تێدەگات کە چارەسەرییەکی ئەوتۆی لەبەردەستدا نییە جگە لە سەرکەشیگەلێکی درێژخایەن لە بەستێنی دەروونناسی و کۆمەڵناسیدا و، لەم سەرکەشیانەشیەوە، بەڕوانینێکی یەکگرتووەوە لە پانتایی گشتگیری زانستە مرۆییەکانەوە دەگەڕێتەوە بۆ تیۆری داڕێژیی ئەدەبی؛ روانینێک کە لەسەر یەکبوونی بابەتەکان، واتە بابەتی دەقەکان، دامەزراوە و پشتی بەستۆتە یەکبوونی ڕێبازی دەقەکان ، واتە راڤەی ئەو دەقانە یان، بەواتایەکی تر، وەرگرتنی وڵامدەرانە[ی ئەو دەقانە].

باختین سەرنجێکی زۆر تایبەت ئەداتە زانستەکانی زمان و، لەم بەستێنەشدا، لە سەرەتای بیستەکاندا، رووبەڕووی دوو روانگەی زێدەڕۆیانە دەبێتەوە: لەلایەکەوە، دیدگای رەخنەی شێوازناسانە کە جگە لە دەربڕینی تاکەکەس بایەخ بەهیچ شتێکی دیکە نادات و، لەلایەکی تریشەوە، زمانناسیی بنەمایی کرچ و کاڵ (سوسوور)، کە لە زمان بە واتا گشتییەکەی پارێزگاری ناکات و، تەنیا ئاوڕ لە زمان بە واتا تایبەتییەکەی ئەداتەوە، واتە شێوەی رێزمانی – دەرهەستانە. بەڵام، مژاری هەڵبژاردەی باختین، واتە گوزارەی مرۆیی، بەردەوام لە زماندا جێگیر دەبێ. گوزارەی مرۆیی بەرهەمی کردار و پرچەکرداری نێوان زمان و بەستێنی گوزارەسازییە (پێوەندیی گوتەیی و کەلامی) – ئەمەش ئەو بەستێنەیە کە بە مێژووەوە گرێدراوە. بەپێچەوانەی بیروڕای زمانناسان و شێوازناسان، گوزارەی تاکەکەسی بە شێوەیەکی بێ سنوور بگۆڕ و گۆڕانکاری هەڵگرە؛ کەواتە ئەگەری ناسینی لە ئارادا نییە. گوزارە دەتوانێ و دەبێ ببێتە بابەتێکی زانستی نوێی زمان کە باختین ناوی ناوەتە «ئەوپەڕی زمانناسی».

کەواتە، بەم چەشنە بەسەر دووفاقێتی و جیایی وێرانکەری شێوە و ناوەڕۆکدا زاڵدەبێ و پێداچوونەوە و لێکدانەوەی ئایدیۆلۆژیاکان دەستپێدەکات.

گرنگترین تایبەتمەندیی گوزارە - یان ئەو تایبەتمەندییەی کە زۆربەی کات فرەتر لەوانی تر پشتگوێ خراوە - تایبەتمەندیی وتووێژانەیە، کە ئەمەش هەمان رەهەندە کە بە «نێوان دەقێتی» ناسراوە. لەسەردەمی ئادەم پێغەمبەر بەم لاوە چیدی چەشتگەلی ناولێنەنراو لە گۆڕێدا نین؛ هەڵبەت نەک ئەو واژانەی کە پێشتر بەکارنەهێنراون. هەر گوتارێک، بەئەنقەست یان بەبێمەبەست، لەگەڵ گوتارە پێشووەکاندا کە دەربارەی هەمان بابەت دەربڕاون و لەگەڵ گوتارە داهاتووەکاندا کە کاردانەوەیان پێشبینی و هەستپێدەکرێت، جۆرێک لە وتووێژ دروستدەکات. دەنگی کەسێک ناگاتە گوێ مەگەر ئەوەی کە بچێتە نێو هاوئاهەنگیی ئاڵۆزی دەنگە ئامادەکانی ترەوە. بابەتی ناوبراو نەک هەر سەبارەت بە ئەدەب بەڵکو بۆ هەر گوتارێکی دیکەش راستە و، باختین بەم چەشنە دەگاتە پێشگەلالەی لێکدانەوەیەکەی تازەی کولتوور: کولتوور لە گوتارگەلێک پێکهاتووە کە لە یادەوەریی کۆیی (بیروبڕوا باوەکان و ئەندێشە کلێشەییەکان‌و وتراوە شاز و تایبەتەکان) پارێزگاری دەکات، گوتارگەلێک کە هەر بێژەرێک ناچارە لە هەمبەریاندا هەڵوێستی دیاریکراوی خۆی هەبێ.

رۆمان باشترین چەشنە بۆ پەرەپێدانی ئەم چەند دەنگییە و، هەر بەم بۆنەشەوە، باختین بەشێکی زۆری بەرهەمەکانی خۆی بۆ ئەم چەشنە ئەدەبییە تەرخانکردووە. ئەو بە تیشک خستنە سەر شێوازناسیی ژانری رۆمان، کە لە هەمان کاتدا بنەما ئایدیۆلۆژیکەکانیشی دەستنیشاندەکات، تابلۆیەکی فرەگیر لە سەرجەم



گۆڕانکارییەکانی پەخشانی گێڕانەوەیی لە ئەوروپا دەنەخشێنێ. ئەم گۆڕانکارییە پێبەندی دژوازییەکی بەردەوام و بگۆڕە و لە نێوان دوو ژێیاتی جیاوازدایە:

ئاراستەیەک بەرەو لای یەکێتی و ئاراستەیەکی تر کە "زۆرینە" دەپارێزێ. ئەم لێکدانەوەیە دواتر ئولگووە شوێنیو کاتییەکانیش (Chronotopes) لە خۆ دەگرێ، کە بۆخۆیان ئاکامی ژێرچەشنە گێڕانەوەییەکانن. بەم جۆرە واتایەکی بنەمایی دەخرێتە سەر شێوازناسیی باختین. لێرەدا پەل بۆ بەربڵاوترکردنەوەی بابەتێک دەهاوێژێ کە دەکرێ ناوی «بوتیقای گوزارەسازی»ی لێ بنرێ.

چارەسەری ئەم دژوازییە، سەرکەوتنی خوازیاری بەرەو زۆرینەیە کە تەشقەکەی لە رۆمانەکانی داستایۆڤسکیدا وەدیار دەکەوێ و دەزانین کە بەرهەمەکانی داستایۆڤسکی نەک هەر بابەتی یەکەم کتێبی بڵاوکراوەی باختین پێکدێنێن، بەڵکو رێنوێن و پێشاندەری هزر و رێبازەکەشیەتن. هەر بەم بۆنەوەیە کە روانینی قووڵی باختین بۆ رۆمان دەگاتە جۆرێک لە مرۆڤناسی و جارێکی تریش، کارێگەرێتی تیۆریداڕێژیی ئەدەب لە خودی تیۆریداڕێژییەکەش تێدەپەڕێ: مرۆڤ بەڕاستی لە ناخی خۆیدا، بەشێوەیەکی بێکۆتایی، ناهاوچەشنە و بوونی نییە، جگە لە وتووێژدا: هەربۆیە لە ناخی بوونداریی مرۆییدا «ئەویدی» دەدۆزینەوە. تەوەرەی سەرەکیی ئەم مرۆڤناسییە هەر ئەو بایەخانەیە کە بەبڕوای وی بەسەر مێژووی ئەدەب و ئەوپەڕ - زمانناسی و هەروەهاش بەسەر وردبینی و پێداچوونەوەی رێبازناسیی زانستە مرۆییەکادا زاڵ بوونە: تیشکی هەندێ چەمک وەک «گەڕیان»، «ناتەواوی» و «وتووێژ» بەسەر سەرجەم هزرو ئەندێشەی باختین -ەوە بەسانایی وە دیار دەکەوێ. ئەوەشمان نابێ

لە بیر بچێت کە وشەی «پرسەکان» یان یەکێ لە هاوواتاکانی ئەم وشەیە لە ناونیشانی گرنگترین دەقەکانی باختیندا بەکارهێنراون.

ئەندێشەی باختین فرەتوێ و ئاڵۆزە و لە هەمانکاتیشدا بەچێژێکی تەواوەوە وەردەگێڕدرێ، بەڵام چوونە ناو ئەم ئەندێشەیە (ئەگەرچی لە ناخی خۆیدا زۆریش تاریک نییە) زۆر دژوارە. ئەم دژوارییە هەندێ هۆی هەیە:

هۆی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ مێژوو – هەڵبەت زۆرتر ڕێکەوتی بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی مەبەستە تاکو ڕێکەوتی نووسینیان. دوو بارودۆخی تایبەت ڕوونکەرەوەی ئەم مێژووەیە: یەکەم ئەوەی کە باختین پاش پێنج ساڵ دوای بڵاوبوونەوەی یەکەم کتێبی هیچ شتێک بە ناوی خۆیەوە بڵاوناکاتەوە، لە کاتێکدا هەرلەم ساتەوەختەدا چەندین بەرهەم بڵاودەکرێنەوە کە یان لە سەردەستی ئەو نووسراون و یان لە ئەندێشەکانی وی سروشیان وەرگرتووە; بەلام هاوڕێیانی، ڤ، ڤۆلۆشینۆڤ و پ. مێدڤێدۆڤ، بەناوی خۆیانەوە ئەو بەرهەمانەیان بڵاودەکردەوە. ئەم خاڵەش تا ئەم دواییانە (تا ساڵی ١٩٧٣) لای هەموان شاراوە بوو و مشتومڕ دەربارەی نووسەری ڕاستەقینەی ئەم کتێبانە هێشتا نەگەیشتۆتە هیچ ئەنجامێک.

لەلایەکی دیکەوە، باختین لەسەرتاسەری قۆناغی تازەی چالاکییە دواییەکانی خۆیدا شتی زۆری دەنووسی بەبێ ئەوەی مەبەستی بڵاوکردنەوەیانی هەبووبێ (جگە لەو کتێبەی دەربارەی داستایۆڤسکی نووسیویەتی). کتێبی *بەرهەمەکانی فرانسوا رابلێ و کولتووری جەماوەری لە چەرخەکانی ناوەڕاست و ڕۆنیسانسدا* بیست و پێنج ساڵ پاش نووسینی بڵاودەکرێتەوە. ئەمەش وێڕای ئەوەی کە پاش مەرگی باختین (لە ١٩٧٥دا) هەندێ دەقی گرنگ کە لە سەردەمە جیاجیاکانی



ژیانیدا نووسراون، دەگەنە قۆناغی بڵاوبوونەوە: خودی دانەر، چاودێریی یەکەم کۆمەڵە بەرهەمی خۆی دەکات و دووەمیشیان ئەو کەسانەی بڵاوی دەکەنەوە کە دەستنووسەکانی باختینیان لەلایە.

وەها بارودۆخێک دوو جۆر «ئاڵۆزی» بەشوێن خۆیدا دەهێنێ: دەستەی یەکەم تەنیا ماددین. دەقە بڵاوکراوەکانی ساڵەکانی بیستەکان دەمێکە لەبەردەستدا نین، بەتایبەت – بەڵام نەک هەر بۆ ئەو توێژەرەوانەی کە لە دەرەوەی یەکێتی سۆڤیەت چالاکی دەنوێنن. لە لایەکیترەوە مێدڤێدۆف و ڤۆلۆشینۆڤ هەردووکیان لە سییەکاندا لە چاوان ون دەبن وکەس نایاندۆزێتەوە و ئەمەش بەتەواوی کاری کردۆتە سەر نەمانی بەرهەمەکانیان. بارودۆخی بەرهەمە بڵاونەکراوەکان، بەتایبەت ئەوانەی کە ئەمڕۆکە گەیشتوونەتە دەستی ئێمە، تۆزێ جیاوازە: ئێمە نازانین ئەوانە لە نێو چ دەقگەلێکەوە قۆستراونەتەوە و لە چۆنییەتی کۆی داهێنانی نووسراوە (و سەرزارەکی، بەڵام تۆمارکراو)ی باختین ئاگادار نین. بەڵام بڵاونەبوونەوەیان (یان درەنگ بڵاوبوونەوە و یاخود بڵاوبوونەوە بەناوی خوازراوەوە) لە ناوەوەشڕا کاریگەرێتی لەسەر بینای ئەم دەقانە داناوە.

سەرەڕای ئەوەی کە باختین هزرڤانێکە کە هەڵبژاردنە سەرەکییەکانی بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر نەگۆڕو یەکدەستن، دەقە بڵاوکراوەکان (بەتایبەت دەقە بڵاوکراوەکانی سەردەمی ژیانی خۆی) بەتەنیایی ناتوانن ڕووناکی بەخشی ڕێگای تێگەیشتن لەکۆی سیستەمی فیکریی ئەو بن. لەم بەرهەمانەیدا کە بۆ چاپی خێرا تەرخان نەکراون و بەئاوڕدانەوە لە خوێنەری تازە (کە لە هەموو دەقەکاندا ڕووبەڕووی دەبینەوە) نەنووسراون، هیچ هۆکارێک بۆ ڕێکخستن و پێکەوەلکانی پارچە جیاجیاکانی ئەم سیستەمە فیکرییە ڕەچاو نەکراوە. سەرجەم

خوێنەران تا کاتی مردنی باختین تەنیا دوو کتێبی ئەویان دەربارەی داستایۆڤسکی و رابلێ لەبەردەستدا بوو، ئەمەش لە وانەیە هەندێ هەڵەی لێکدانەوەیی گەورەی بەدواوەوە بێ، لەبەرئەوەی کە دوو پارچەی بچووک و بینراوی کێوی سەهۆڵ لەبری هەمووی دانراوە- بەبێ ئەوەش کە تەنانەت پێوەندیی ئەم دوو پارچەیە روون کرابێتەوە. باختین بۆ خۆی لەگەڵاڵەی- ناتەواوی – پێشەکییەک لەسەر کۆمەڵە بەرهەمی ساڵی ١٩٧٥، ئەم خاڵەی دەستنیشان کردووە:

> یەکگرتوویی چەمکێکە لەکاتی نووسیندا دێتەدی (لەکاتی پێشکەوتندا). هەر ئەم بابەتەش بۆتە هۆی جۆرێ ناتەواویی ناوەکی لە زۆربەی ئەندێشەکاندا. بەڵام نامەوێ ئەم خاڵە لاوازە بگۆڕم و بیکەم بەقازانجێک. لەبەرهەمەکانی مندا زۆر ناتەواویی دەرەکیی دیکە لەئارادان، ناتەواویی نەک هەر ئەندێشە، بەڵکو دەربڕین ونواندنی... یان حەزی من بۆ گۆڕین و جۆراوجۆریی وشەکان، بۆ ناولێنانی تاقە دیاردەیەک، چەند فاقێتی روانگەکان و، نزیکبوونەوە لە کۆتایی بەبێ ناوبردنی ئاڵقە ناڤین و نێوەنجییەکان.

### باختین، جوانیناسیی داهێنانی گوتەیی

ئەم بانگەشانە بەهیچ شێوەیەک زێدەڕۆیانە نین و کاتێ دەمانەوێ «ناتەواویی ناوەکی»ی ئەندێشەی باختین بپارێزین، دەبێ بۆ کامڵکردنەوەی دەربڕین و پێناسە و دەستنیشانکردنی هاوواتاو واژە چەندمانایییەکان و دابینکردنی ئاڵقە نێوەنجییە ونبووەکان دەست بدەینە کارێکی زۆر گەورەوە.



من لێرەدا شان بەشانی ئاماژەدان بەو دژوارییانەی کە خوێنەرانی باختین رووبەڕووی دەبنەوە، زانینی زمانی رووسیشم وەکو پێشگریمانە داناوە، بەڵام خوێنەرە رۆژئاواییەکان لە رێگەی وەرگێڕانەوە لەگەڵ ئەم بەرهەمانە ئاشنابوونە و دووهەمین دژواریی گەورەش هەر لەم بابەتەدایە. ئەم وەرگێڕانانە لە گۆڕێدان، بەڵام لەوە دڵنیا نیم کە بە تەواوی دڵخۆشکەر بن. من کە بۆ خۆشم دەستم داوەتە پیشەی وەرگێڕان هاوکارەکانم بەهۆی هەرچەشنە چەوت تێگەیشتنێکی لە خۆڕاییەوە سەرکۆنە ناکەم. بەڵام لێرەدا بەپێچەوانەوە، ئەوە بەکارەسات دەزانم کەبەرهەمەکانی باختین لەسەر دەستی هەندێ کەسەوە وەرگێڕدراونەتەوە کە سیستەمی فیکریی ئەویان نەناسیوە, یان لێی تێنەگەیشتوون (ئەوەش بڵێم کە بابەتێکی زۆر ساکاریش نەبووە). لە ئەنجامدا، چەمکە سەرەکییەکانی سیستەمی فیکریی باختین وەکو گوتار، گوزارە، لۆژیکی چەندفاقێتی و دەرەوەییەت و زۆر چەمکی دیکە وەرگێڕدراونەتەوە سەر هەندێ هاوواتای ناڕاستەوخۆ یاخود بەهۆی پێداگریی وەرگێڕ لەسەر دووبارە نەکردنەوە یاخود ساکارکردنەوە، ئەم چەمکە بەتەواوەتی لەناوچووە. وێڕای ئەمەش، زۆربەی کات وشەیەکی رووسی لەسەر دەستی وەرگێڕە جیاجیاکان بەشێوەگەلێکی جیاواز وەرگێڕدراوەتەوە و هەر ئەمەش هەندێ دژواریی دەستکردی بۆ خوێنەری رۆژئاوایی هێناوەتە دی. بەڵام سەرباری هەموو ئەمانە، وزەی هزرو ئەندێشەی باختین کە توانیویەتی رێگەیەک بۆ گەیشتن بە ستایشکەرە رۆژئاواییەکانی خۆی بدۆزێتەوە (کە ژمارەشیان کەم نییە)، شایانی دەستخۆشی و ستایشە.

خڕبوونەوەی ئەم دوو بابەتە – گرنگایەتی ئەندێشەی باختین و دژواریی ناسینی ئەم ئەندێشەیە- هانی دام تاکو ئەم لاپەڕانە بنووسم و

هەر ئەمەش تەنانەت شێوەی گەلاڵەی نووسینەکەشی دابینکردووە. بۆشایی هەرە گرنگی من، کە هەوڵی زۆریش بۆ چارەسەرکردنی ئەدەم، لە ئاستێکی زۆر سەرەتاییدایە (بەڵام لە هەمانکاتدا، ئاستێکی زۆر بنەڕەتی و سەرەکی): مەبەست تەنیا ئەوەیە کە بەرهەمەکانی باختین بۆ سەر زمانی فەرەنسی و بەشێوەیەکی خوێنەرانە وەربگێڕدرێنەوە. ناتوانم بانگەشە بۆ ئەوە بکەم کە دەقی بەردەست بەڕاستی هی منە: تاڕادەیەک هەر بەهەمان شێوە کە ژان ستارۆبینسکی خوێندنەوەی کتێبەکەی فردینان دوسوسووری دەربارەی نیشانە بۆ ئێمە هەمواركردووە، منیش پێم وابوو کە لە بەستێنێکی جیاوازدا و بەکۆمەڵە دژوارییەکی دیکەوە شتێکی تر، واتە ئەندێشەکانی باختین، بناسێنم و، بۆ ئەم مەبەستەش دەستم داوەتە جۆرێ مۆنتاژ کە، تا رادەیەک، لە هەڵبژاردەی بەرهەمەکان و لێکدانەوەیان، رستەکانی من بەشێوەیەکی کامڵ هی خۆم نین، هەڵبەت سەر لەبەری دەقە ناوبراوەکانم سەر لە نوێ وەرگێڕدراوەتەوە. بەبێ نەفیکردنەوەی ئەو بەلاڕێدابردنانەی کە رەنگە بەدوای تەنانەت بچووکترین راڤەکانیشدا سەرهەڵبدەن، پێم وایە دەکرێ ناوی من لە ریزی یەکێک لەو ناوە خوازراوانەی کە باختین بەکاری هێناون دابنرێ. (بەڵام ئاخۆ ئەم ناوانە هەر تەنیا خوازراون؟)

بەم بۆنەشەوە - هەر لە بنەڕەتەوە- خۆم لە وتوویژ لەگەڵ باختیندا دزیوەتەوە. بەر لە دەستپێکردنی وتوویژ، دەبێ یەکەمین دەنگ ببیسترێ. لێرەشدا سەرنجم نەداوەتە ئەو هەڵوێست و کاردانەوە زۆرانەی کە بڵاوبوونەوەی یەکەمین بەرهەمەکانی باختین لە رۆژئاوادا هەڵیگرساند. تاڕادەیەک سەر لەبەری ئەم هەڵوێستانە لەسەر هەندێ چەوت تێگەیشتنی «رەوا» دامەزراون.

لە کۆتاییشدا، دەبێ بڵێم کە (جگە لە هەندێ شوێنی تایبەت) قەت دەستم نەداوەتە بەراوردکاریی ئەندێشەی باختین لەگەڵ ئەندێشەی نووسەرانی دوای ئەو. بەڵام زۆربەی کات دەربارەی سەرچاوگە و سەرچاوەکانی هزر و ئەندێشەی باختین توێژینەوەیەکی ئەوتۆم ئەنجامداوە: لەوێشەوە کە بەرهەمی باختین زۆر فرەرەهەندە و فرەچەشنە، دیار نییە کە رەوتی وەبیرهێنانەوەکان لە کوێڕا لە گەڕیان دەکەوێ و گومان لەوەش‌دا نییە لە زۆر شوێندا، ئەندێشەکانی باختین بەتەواوی «ئیمڕۆیی» دێنە بەرچاو چونکە پێشوەخت رارێژییەکانی نووسەرە بەناوبانگەی ئەورۆ وەبیر دەهێنێتەوەو، یان تەنانەت لەوانەش تێدەپەڕن. ئەم بەراوردکارییانە، بەڕاستی و لە بنەڕەتدا، لەم دەقەی ئێستادا رواڵەتێکی پاڵەکییان هەیە: لەوانەیە کە کاریان کردبێتە سەر شێوەی خوێندنەوەی من بۆ باختین، بەڵام لەم کتێبەی بەردەستدا، باسکردنی ئەم بابەتە جێگەیەکی ئەوتۆی بۆ تەرخان نەکراوە.[1]

١- لێرەدا دەخوازم سوپاس و پێزانینی خۆم بۆ ئەو کەسانەی لە نووسینی ئەم کتێبەدا یارمەتییان داوم دەربڕم: لادسیالاڤ، ماتیکا، میخاییل هولکیست، ژۆرژ فیلیپینکۆ و هەندێ هاوڕێی تر لە یەکیەتی سۆڤیەت و هەنگاریا و مونیک کانتۆ.



## (٢)
## ژیاننامەی باختین

### تێزڤێتان تۆدۆرۆڤ

سەرچاوەی سەرەکیی زانیارییەکانی ئێمە دەربارەی رووداوەکانی ژیانی باختین نووسراوەیەکی کورتە لە دەستپێکی کتێبێکدا سەبارەت بەرێزلێنان لە باختین کە لە یەکیەتی سۆڤیەتدا بڵاوکراوەتەوە. منیش لێرەدا هەر تەنیا دەچمە سەر کورتکردنەوەی ئەو نووسراوەیە و هەندێ زانیاریی وردی دیکەش، کە لەسەرچاوەکانی ترەوە وەرم گرتوون، دەخەمە سەری.

میخاییل میخاییلۆڤیچ باختین لە ساڵی ١٨٩٥ و لە «ئۆرل» لە بنەماڵەیەکی مامناوەندی بە رەگەزی ئاغاواتییەوە لە دایک بووە. باوکی فەرمانبەری بانک بوو. سەردەمی منداڵێتی باختین لە ئورل تێپەڕبوو و تافی مێردمنداڵی و لاوێتشی لە «ڤیلنو» و «ئۆدسا» بردە سەر. لە زانکۆی ئۆدسا و پاشان زانکۆی پیترزبورگ دەستی کرد بەخوێندنی واژەناسی و لە ١٩١٨دا بڕوانامەی بەکالێریۆسی لە زانکۆی پیترزبورگ وەرگرت. پاش ئەم قۆناغە پیشەی وانەوتنەوە و مامۆستایی هەڵبژارد: سەرەتا لە شارۆچکەی «ئۆرل» (١٩١٨–١٩٢٠)

و پاشان له ١٩٢٠ له ڤیتێپسک، لەوێ لە ساڵی ١٩٢١دا ژنی هێنا و، هەر لە «ئورل» بوو کە یەکەمین ئاڵقەی «هاوڕێیانی هاوبیر» بەبەشداریی ئەم کەسانەی خوارەوە پێکهات: ڤالێریان نیکۆلاوئوڤیچ ڤۆلۆشینۆڤ (١٨٩٤یان١٨٩٤- ١٩٣٦ ) شاعیرو مۆسیقازان، لێڤ ڤاسیلینۆڤیچ پۆمپیانسکی (١٩٠٤-١٩٨١) فەلسەفەکارو پسپۆڕی ئەدەب، خانمی پیانۆژەن چێ. بێ. یودینا (١٩٤٥-١٩٣٧)، بێ. نێ. زوباکین (١٨٩٤-١٩٣٧) شاعیر، ئیسائۆڤیچ کاگان (١٨٨٩-١٩٣٧) فەلسەفەکار. ئەم فەیلەسووفە، کە لەو کاتەدا دەوری مامۆستای و پێشەنگی دەگێڕا، ماوەیەک پێش لە ئەڵمانیاوە هاتبوو و لەوێ لە لایپزیک، بێرلین و ماربورگ فەلسەفەی خوێندبوو. هەروەهاش قوتابیی هێرمان کوهن بوو و ئاگاداری وانەکانی کاسیرر- یش بوو. کاگان سەرەتا تاقمێکی خۆماڵی لە هاوڕێ هاوبیرەکانی خۆی کۆدەکاتەوە کە بە «ئەنجومەنی کانتی» ناوبانگ دەردەکەن. ئەندامانی ئەم تاقمە، شان بەشانی چالاکییە تاکەکەسییەکان، لە هەندێ مشتومڕی گشتیدا بەشداریدەکەن و چەند دانیشتنێکی تایبەت بەلێدوانیش بەڕێوەدەبەن. لە رۆژنامەیەکی ناوچەییدا بەناوی *مۆلۆت* (وانەی چەکوشی)، هەواڵێک دەربارەی یەکێ لە دانیشتنەکانیان، کە بۆ بابەتی «خوا و سۆسیالیزم»تەرخانکرابوو، بڵاودەکرێتەوە. ئەم راپۆرتە هەواڵە نەک هەر کەشو هەوای زاڵی رووسیا لەو سەردەمەدا، بەڵکو سەرنجی تایبەتی باختین-یش بۆ بابەتە ئایینیەکان پیشاندەدا:

*هاوڕێ باختین لە لێدوانەکەی خۆیدا لە بەرگریکردن لە لمپۆزبەندی تاریکبیریی ئایینی، بەنێو هەورەکاندا و لەسەر ئاسمان هەڵدەفڕێ. لە قسەکانیدا تەنانەت تاقە نموونەیەکی زیندوو لە مێژوو و ژیانی مرۆڤ لە*



*گۆڕێدا نەبوو. هەندێ جار دەستی دەکرد بەقسەکردن و دەچووە سەر ستایشکردنی سۆسیالیزم، بەڵام بەناڕەحەتی و نیگەرانییەوە ئەوەشی وەبیر دەهێنایەوە کە هەر ئەم سۆسیالیزمە هیچ سەرنجێک بۆ مردووەکان راناکێشێ (لەوانەیە رێورەسمی پرسە گێڕان بەئەندازەی پێویست بەڕێوە ناچێ)، ئەوەش کە گوایە لە داهاتوودا، خەڵک ئەم هەڵەیەمان نابەخشن... بەگشتی کاتی بیستنی قسەکانی ئەو ئەم بیرۆکەیە دەهاتە نێو زەینی مرۆڤەوە کە سەر لەبەری ئەم سوپا کفنپۆش و پەزێرەیە، لە چرکەیەکدا لەگۆڕ هەڵدەستن و ئەوەی کۆمۆنیستە و تەنانەت سۆسیالیزمە هاندەرەکەشیان لەسەر گۆی زەوی پاک دەکەنەوە. لێدوانی پێنجەم هی هاوڕێ گوتمان بوو (١٣ی دیسەمبەری ١٩١٨).*

دوای گواستنەوەی ماڵی باختین و (چوونی کاگان بۆ پیتروگراد و پاشان بۆ ئورل) ئەنجوومەن سەر لە نوێ لە ڤیتێبسک پێکدەهێنرێتەوە و لەوێ ڤۆلۆشینۆڤ و پومپیانسکی و هەندێ هاوڕێی تازەی تریش بەشداری تێدا دەکەن: پاول نیکۆلا ئوڤیچ مێدڤێدۆڤ (١٨١٩-١٩٣٨) رەخنەگر، سولرتنیسکی -ی مۆسیقاناس و مارک شاگال -ی شێوەکار. باختین لێرەدا ئەدەب و جوانیناسی دەڵێتەوە. لە ١٩٢١دا بەهۆی نەخۆشیی درێژ خایەنی چڵکی ئێسقانەوە لە جێدا دەکەوێ- لە ١٩٣٨یش هەر بەهۆی ئەم نەخۆشییەوە لاقێکی دەپەڕێنن- لە ١٩٢٤دا دەگەڕێتەوە بۆ پیترۆگراد. لەوێ برادەرانی خۆی دەبینێتەوە کە بریتی بوون لە ڤۆلۆشینۆڤ و پومپیانسکی و مێدڤیدۆڤ، ئەنجوومەنێکی تازە (سێهەمین ئەنجومەن) پێکدێ کە ئەمجارە ن. - کلیوئیڤ-ی شاعیر، واکنۆڤ-ی رۆمانووس، م. ئوبیانسک-ی هیندناس، ی. ئوبیانسکی مۆسیقاناسو، ی. کانائیڤ-ی زیندەوەرناس و دیرۆکڤانی

زانستەکان-یش لە خۆ دەگریّ. باختین لە ریّگەی هەندیّ ئیش و کاری نابەردەوامەوە دریّژەی بە ژیانی خۆی دەدا. لە ساڵی ١٩٢٩دا کتیّبی *پرسەکانی بەرهەمەکانی داستایۆڤسکی* بڵاودەکاتەوە. ئەوەش دەزانین کە یەکەم نووسینی ئەم بەرهەمە لە ساڵی ١٩٢٢دا کۆتایی پیّهاتبوو و بیّگومان جیاوازی زۆری لەگەڵ دەقی چاپکراودا هەبوو. هەر لەم ساڵەدا- ١٩٢٩- باختین بەبیانوویەک، کە ئاگاداری نین و رەنگە پیّوەندیی بە چەشنی هەڵسوکەوتی وی لەگەڵ ئایینی ئۆرتۆدۆکسدا هەبوویّ، دەگیردریّ و دەخریّتە بەندیخانەوە و لە راستیدا هەر بەم بۆنەشەوەیە کە لە ساڵی ١٩٢٨دا پۆمپیانسکی-یشیان گرت. پۆمپیانسکی لە ساڵی ١٩٢٨دا لە نامەیەکدا بۆ کاگان- کە نیشتەجیّی مۆسکۆ بوو- ئاماژە بۆ دانیشتنەکانیان دەکات: «لە تەواوی ئەم ساڵانەدا, بەتایبەت ئەمساڵ ئیّمە بەردەوام دەچینە سەر تیۆلۆژی و خواوەندناسی. لە ئەنجومەندا نزیکترین هاوریّکانمان- هەمان کەسەکان بەشدارن: م.ب. یودینا، م.م. باختین، م.ی ئوبیانسکی و بۆخۆم.» پاشان باختین بەپیّی حوکمیّک بۆ ماوەی سی و پیّنج ساڵ دوور دەخریّتەوە بۆ ئوردوگایەک لە سولوڤکی، بەڵام بەهۆی باری نالەباری تەندروستییەوە، سزاکەی تاڕادەیەک کەم دەکریّتەوە و، دەنیّردریّ بۆ کازاخستان. بەم چەشنە لە ساڵی ١٩٢٠ بەم لاوە لە گوندی کوستانە لە سنووری سیبری و کازاخستان ژیان دەباتە سەر. لە ریّکخراوە جیاجیاکاندا وەکو فەرمانبەر و کارمەند دەستدەکات بەتیبینی و کارکردن. لە ١٩٣٦دا، بۆ دامەزراوەی پەروەردەیی سارسینک بەمەبەستی وانەوتنەوە و فیّرکاری بانگهیّشت دەکریّ. لە ١٩٣٧دا دەچیّ بۆ کیمر، کە شارۆچکەیەکە سەد کیلۆمەتر لە مۆسکۆوە دوورە و لەویّ لە قوتابخانەیەکی ئامادەییدا دەستدەکا بە



وتنەوەی زمانی رووسی و ئەڵمانی. هەر لە هەمان کاتدا، لە کار و بەرنامەکانی ئەنیستیتۆی ئەدەبی ئاکاریی زانستەکان لە مۆسکۆ بەشیّوەیەکی نابەردەوام بەشداری دەکا. لە ١٩٤٥دا دەگەڕیّتەوە بۆ دامەزراوەی پەروەردەیی سارسینک و تا قۆناغی خانەشینی لە ١٩٦١ هەر لەویّ دەگیرسیّتەوە. کتیّبەکەی دەربارەی داستایۆڤسکی بەزیادەیەکی بەرچاوەوە لە ساڵی ١٩٦٣ دووبارە چاپ دەکریّتەوە.

لە ساڵی١٩٦٥دا کتیّبەکەی لەسەر رابلیّ بڵاودەبیّتەوە کە لە راستیدا نامەی دوکتۆراکەیەتی کە لە ساڵی ١٩٣٠دا نووسیبووی و لە ١٩٤٦دا بە زەحمەتیّکی زۆرەوە ئاراستەی دەکا و بڕوانامەی پیّ دەبەخشریّ. دوابەدوای خراپیی باری تەندروستییەوە لە ١٩٦٩ لە مۆسکۆ دەمیّنیّتەوە. دوا ساڵەکانی ژیانی خۆی لە ئاسایشگایەکی بە ساڵاچوواندا لە کلیموڤسک لە نزیک مۆسکۆ بەسەر دەبات. لە مانگی مارسی ١٩٧٥دا و لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا مۆمی ژیانی دەکوژیّتەوە. ریّورەسمی ناشتنی باختین بە گویّرەی ئایینی ئۆرتۆدۆکس ئەنجامدەدریّ.

ژیانی تەریکی باختین هاوریّ و هاوکاتی چالاکیی وی لە بەستیّنی نووسیندایە. چەندین کتیّبی دیکەش دەخریّتە سەر ئەو دوو کتیّبەی کە لەسەردەمی ژیانیدا بڵاوکرانەوە. ئەم کتیّبانە دەکریّ بەدوو دەستە دابەشبکریّن: ئەو بەرهەمانەی پاش مەرگی بڵاوبوونەتەوە و ئەوانەی کە بەناوی خوازراوەوە چاپ دەکران. باختین لە دریّژایی دە ساڵی کۆتایی ژیانیدا، پوختە و کورتەی هەندیّ لە دەستنووسەکانی لە دوو بڵاڤۆکی تارادەیەک رەسمیدا (Kontekst 9 Voprosy Literature) بڵاودەکاتەوە. زۆربەی ئەم وتارانە لە کتیّبیّکدا و لەسەردەمی خۆی کۆدەکریّتەوە کە چەند مانگ دوای مردنی چاپ دەکریّ. ئەم کتیّبە

هەمان *پرسەکانی ئەدەب و جوانیناسی* -یە. پاش مەرگی باختین بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی یەک لە دوای یەک سەر دەگرێ. کۆمەڵە وتارێکی دیکەش لە ساڵی ۱۹۷۹داو بەناونیشانی **جوانیناسیی داهێنانی گوتەیی** بڵاودەبێتەوە. بەمەبەستی نیشاندانی ئەو شێوەیەی باختین دەپڕژایە سەر بەرنامەکانی خۆی- کە بە شێوەیەکی بەردەوام ئاوا کارێکی هەر نەدەکرد- پێڕستی ئەو کتێبانەی کە تەنیا لە بیست و پێنج ساڵی کۆتایی ژیانیدا گەڵاڵەی بۆ دارشتوون, یان دەستیکردووە بەنووسینیان، بەڵام هەرگیز نەیتوانی کۆتاییان پێ بێنێ،دەخەینەڕوو (ئەم زانیارییانەم لە یادداشتەکانی تازەترین بەرهەمی بڵاوکراوەی باختین وەدەست هێناوە):

١. کتێبێک بەناوی *لێکۆڵینەوە ئەوپەڕزمانناسانەکان*، لە خۆگری بەشێکی گرنگە سەبارەت بە گوتاری ئەویدی وەکو بابەتی زانستە مرۆییەکان و بەشێکی تریشی دەربارەی دەوری ئەو بەستێنانەیە کە لە دەقی یەکەمدان و زۆرتر کار لە گۆڕانکاریی راڤەکانی ئەم دەقە دەکەن.
٢. کتێبی چە*شنەکانی گوتار*، کە وێدەچێ واتاکانی لە کتێبی پێشوو زۆر نزیک بێ.
٣ .کتێبی *لێکۆڵینەوەی مرۆڤناسیی فەلسەفی*، کە هەندێ بابەتی کۆنترین کتێبی وی کە لە ساڵی ١٩٢٤-١٩٢٢دا نووسراوە سەر لە نوێ دەخاتەوە بەرباس و توێژینەوە.
٤. کتێبێکی تازە دەربارەی داستایۆڤسکی بەناوی *داستایۆڤسکی و هەستگەرێتی، نامیلکەی شیکاریی چەشنناسانە.*
٥. کتێبی دیکە دەربارەی *داستایۆڤسکی، بەراوردکاریی رۆمانەکانی و نووسینە رۆژنامەوانییەکانی*، بەتایبەت، یادداشتە رۆژانەکانی نووسەرێک.
٦. لێکۆڵینەوەکەی دەربارەی گوگوڵ.
٧. کتێبێ سەبارەت بە رێبازێک کە نووسەران بۆ دۆزینەوەی دەنگی تاکەکەسی و تایبەتی خۆیان بەکاری دەبەن. ئەگەری ئەوەش لە ئارادایە کە باختین ویستبێتی سێ کتێبی دوایی لە یەک بەرگدا کۆبکاتەوە.

هەڵبەت ئەوەش بڵێم کە بێگومان ئەو پێرستەی سەرەوە کەموکورتی تێدایە و لەوانەشە تاکو ئێستا (نوڤامبری ۱۹۷۹) بەشێکی زۆری دەستنووسەکانی باختین بڵاونەبووبێتنەوە (بەم دواییانە ئاگادارکرامەوە کە کۆمەڵە بەرهەمێکی تازە لە نووسراوە بڵاونەکراوەکانی باختین لە سۆڤیەت لە ژێر چاودێری و. کوژینۆڤ ئامادەی بڵاوبوونەوەیە).

سەبارەت بەو نووسینانەش کە ئیمزای خوازراویان لەسەرە، دۆخەکە زۆر ئاڵۆزتر دەبێتەوە. ئەم پرسە لە ١٩٧٢دا، بەهۆی قسەکانی و. د. ئیفانۆڤ، نیشانەناسی خەڵکی سۆڤیەت و هۆگری باختین کەوتە گەڕو و دەستی پێکرا. ئەم قسەگەلە لە یادداشتی ژمارە ١٠١ی کتێبێکدا دەربارەی دەوری هەرە گرنگی باختین لە پێشڤەچوونی نیشانەناسیدا هێنراونەتەوە. لەم یادداشتەدا ئەم وتانەی خوارەوە دەخوێنینەوە:

> *دەقی سەرەکیی ئەم شەش بەرهەمە (کتێبێ بەئیمزای مێدڤێدۆڤەوە، دوو کتێب و سێ وتار بە ئیمزای ڤۆلۆشینۆڤ.) لەسەر دەستی باختین هاتوونەتە بەرهەم. قوتابییەکانی، و. ن. ڤۆلۆشینۆڤ و پ.ن. مێدڤێدۆڤ،*

*کە ئەم بەرهەمانە بەناوی ئەوانەوە بڵاوبوونەتەوە زۆر کەم دەستیان لەو دەقانە وەرداوە و شتی کەمیان خستۆتە سەر و هەندێ بەشیشیان (یان لە هەندێ شوێندا وەکو مارکسیزم و فەلسەفەی زمان ناونیشانەکەیان) گۆڕیوە. دەقی ئەم بەرهەمانە ناچارمان دەکا زیاتر ئەم رایە پەسەند بکەین کە هەموویان دەگەڕێنەوە بۆ یەک نووسەر و وتەی شایەتەکانیش دیسانەوە هەر پیشاندەری ئەم بابەتەیە.*

سەرەڕای ئەم قسانە و هەندێ نیشانەی دیکەش، لانیکەم لە قۆناغی هەنووکەییدا، هیچ پێوەرێکی دەرەکی لە گۆڕێدا نییە کە بەڕاشکاوی و دڵنیاییەوە ئەوە بسەلمێنێ کە باختین نووسەری ئەم کتێبانەیە.ئەو نووسراوانەی کە بەئیمزای ڤۆلۆشینۆڤ و مێدمێدڤەوە دەرکەوتوون، وەک *ڕێبازی شێوەیی لە لێکۆڵینەوە* ئەدەبییەکاندا، زۆر باشتر لەوانی تر دانراون: شێوازی سادە و ساکار، ڕستەگەلی کورت، بەندگەلی فراوان، ناوگەلی لاوەکی جیاجیا و پۆلێنکاریی وردی بەشەکان. ئەو کتێبانەش کە بەئیمزای ڤۆلۆشینۆڤەوە بڵاوکراونەتەوە زۆر ڕەها خواز و دوگماتیک و زۆربەی کات بەبێ هێنانەوەی بەڵگەیەک دەستدەکەن بە ئاراستەکردن و پاشان داسەپاندنی هەندێ حوکمی جۆراوجۆر. بەرهەمەکانی خودی باختین-یش خاوەن پێکهاتەیەکی ئاڵۆزن و لێوالێون لە دووبارەکردنەوە گەلێکی بەردەوامن و هەندێ جاریش بەرەو لای درهەستکاری دەشکێنەوە (کاریگەرێتی فەلسەفەی ئەڵمانیا؟). هەڵبەت ئەم جیاوازییە رووکەشیانە رەتکەرەوەی یەکگرتوویی بەربڵاوی هزرو ئەندێشەی باختین نین. بەم بۆنەشەوەیە کە قسەکانی ئیڤانۆڤ بەم شێوەیە راستەقینە دێنە بەرچاو. بەڵام لە نەبوونی نیشانە دەرەکی و بەراستی قایلکەرەکاندا، بەراوردکاریی



نێوان دەم دەقانە بەئەنجامێکی نەرمرۆیانەتر دەگات: بەبیروڕای من، گەلاڵەی ئەم دەقانە لەسەر دەستی یەک نووسەر (یان هەندێ نووسەری هاوڕا) داڕێژراون، بەڵام بەشێک یان هەموویان نووسراوەی کەسانێکی دیکەن.

... ئاکامێکی تر کە لەم باسەوە دەکەوێتە روو ئەوەیە کە وەلانانی خێرا و بێ دەردیسەری ناوی ڤۆلۆشینۆڤ و مێدمێدۆڤ، کە بەراستی بەپێچەوانەی خواستی ئاشکرای باختین بۆ لە ئەستۆگرتنی بەرپرسایەتی بڵاوبوونەوەی ئەم نووسینانەیە، کارێکی شیاو و گونجاو نییە. بەڵام وەپشت گوێ خستنی یەکێتی ئەندێشە و ئەو یەکگرتووییە هزرییەی لەم بەرهەمانەیدا وەبەرچاو دەکەون وئەوەی کە، بەگوێرەی نیشانەگەلی زۆر، دەکرێ بەهی باختین دابنرێن هەر بەهەمان شێوە هەڵە. کەواتە، پێشنیاری من ئەوەیە کە بۆ کۆی ئەم بەرهەمانە ئەم شێوە پیتچنینەی خوارەوە بەکاربێنین: پاش هێنانەوەی ئەو ناوەی کە بەرهەمەکە بەو ناوەوە بڵاوبۆتەوە، هێڵێک دەکێشین و پاش هێڵەکە، ناوی باختین-یش دەنووسین: مێدڤێدۆڤ/ باختین، ڤۆلۆشینۆڤ/ باختین، هەڵبژاردنی ئەم هێڵە زۆرتر بەهۆی شاراوەییەکی حەشاردراوەوەیە، واتە: لە نێوان ئەم دووکەسەدا چ پێوەندییەک لە ئارادایە؟ ئاریکاری؟ جێگۆڕکێ (ناخوازراو یان نهێنیکاری و شاردنەوە)؟ یان پێوەندیی فیکری (ناوی یەکەم، پیشاندەری وەرگرەو ناوی دووهەم دەربڕێ نێرەر)؟ ئەوەش بڵێین کە ئەم جۆرە پیتچنینە پێشتر لەسەردەستی وەرگێڕی ئینگلیزی کتێبی *ڕێبازی شێوەیی لە لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکاندا*، بەکارهێنراوە.

لە دوای ئەم پەراوێزە دوور و درێژ و بەڵام پێویستەدا، واباشترە بگەڕێینەوە بۆ ژیاننامەی باختین... بەسەرنجدان بەکۆی بەرهەمەکانی

باختین (هەموو ئەو کتێبانەی کە بەئیمزای ئەوەوە نووسراون, یان خراونەتە پاڵ بەرهەمەکانی) دەکرێ ژیاننامەی فیکریی باختین تاڕادەیەک بەسەر شەش قۆناخی گەورەدا دابەشبکرێ:

١. پێش ١٩٢٦: ئەو نووسراوانەی کە خاوەن سروشتێکی تیۆریک و گشتین و دەچنە خانەی نەریتی مەزنی جوانیناسیی فەلسەفیی ئەڵمانییەوە کە لە کانت تا هۆسێرل-ی لە خۆگرتووە. ئەمەش ئەو نووسراوانەن کە باختین بۆ خۆی هەندێ جار وەکو **دەقی دیاردەناسانە** یان **توێژینەوەگەلی فەلسەفەی ئەخلاق** ناویان لێ دەبات. واتە بەرهەمگەلێک دەربارەی مێژووی گشتیی ئەدەبی رووسیا.

٢. ١٩٢٩–١٩٢٦ نووسراوە رێبازناسانە و رەخنەگرانەکان، لەروانگەی مارکسیزمێکی سەرکەش و پەرخاشکەرەوە کە هیچ کامیان لەسەردەستی باختین ئیمزا نەکراون. ئەمە قۆناغی **کۆمەڵناسانە**یە و لە هەمان کاتدا سەردەمی پەروەردەکردنی ئەو ئەندێشانەشە کە بەڕدی بنەڕەتی دەقەکانی قۆناغی دوایی دادەمەزرێنن.

٣. ١٩٣٥–١٩٢٩: توێژینەوە تیۆریکەکان دەربارەی گوزارە و لۆژیکی وتوویژ، لە کتێبەکەی دەربارەی داستایۆڤسکی -یەوە (کە نووسینی یەکەمی لە ١٩٢٢دا تەواو بوو) **تا گوتار لە رۆماندا**.

٤. ١٩٤١–١٩٣٦: راڤەکردنەوەی مێژووی ئەدەبی - بەتایبەت رۆمان. هەندێ بەرهەم دەربارەی شوێنی زەمەندار، رۆمانی فێرکارانە (گوتە)و، هەروەها لەسەر رابلێ و، وتارێکی تێر و تەسەل بەناونیشانی "هەجو" کە بۆ *ئەنسایکلۆپیدیای ئەدەبی* نووسراوە هەر لەم قۆناخەدایە، بەڵام هەرگیز چاپ نەکرا.

٥. ١٩٥٢–١٩٤٢: هیچ دەقێک رێکەوتی ئەم ساڵانەی پێوە دیار نییە، بەڵام لە ژیاننامەکەیدا هاتووە کە باختین لەو ساڵانەی کە لە



دامەزراوەی پەروەردەیی سارانیسکدا (١٩٦١–١٩٤٥) وانەی ئەوتەوە، بابەتی زۆریشی دەنووسی: نووسراوەکانی بریتین لەو وتار و هەواڵانەی کە لەلاپەڕەکانی بڵاوکراوە ناوچەییەکاندا چاپ دەکران (هیچ کەس تاکو ئێستا کۆی نەکردوونەتەوە). بەڵام بەشی هەرە زۆری ئەم نووسراوانە وا بڕیارە چاپ بکرێن. وێڕای ئەمانەش، دەبێ ئەوەش بوترێ کە باختین بەسەدان لێدوانی بۆ کرێکارانی سارانیسک - لە کارگە و کارخانەکان، قوتابخانەکان، رێکخراوەکان و دامەزراوە جیاجیاکان- ئاراستە دەکرد. هەڵبەت ئومێدی ئەوەش لە گۆڕێدایە کە دەقی ئەم وانە و لێدوانانە بەتەواوەتی ون نەکراون... پێدەچێ هەر لەم قۆناخەدا بێ کە کتێبێکی دیکەی دەربارەی هەستگەرێتی لە ئەدەبدا نووسرابێ، کتێبێک کە دەستنووسەکەی لەناو چووە.

٦. ١٩٧٥–١٩٥٣: پێداچوونەوەی بەرهەمە پێشووەکان و گەڕانەوە بۆ بابەتە گرنگە تیۆریکەکان و هەروەهاش بابەتە رێبازناسانە سەرەتاییەکان. نووسراوە بەربڵاوەکانی ئەم ساڵانە کە هیچ کات لە رواڵەتی دەقێکی کامڵ و یەکگرتوودا کۆنەکراونەتەوە، بەباوەڕی من بەرهەمە گرنگەکانی باختین پێک دێنن.

گەرچی دەکرێ لە هەندێ شوێندا بەگومانەوە سەیری دەستنیشانکردنی رێکەوتی راستەقینەی ئەم قۆناخانە بکرێ، بەڵام بوونی ئەمانە لە رەوتی ژیانی باختیندا حاشاهەڵنەگرن. لە هەمان کاتدا، دەشێت بوترێ بەرهەمەکانی باختین، بەمانای ورد و راستەقینەی ئەم واژەیە، پێشکەوتنیان بەخۆوە نەبینیوە. تەوەرەی سەرەکیی سەرنجەکانی باختین زۆرجار دەگۆڕدرێ‌و، هەندێ جار فرمووڵبەندییەکانی خۆشی دەگۆڕێ، بەڵام لە یەکەمین تاکو دوا نووسراوەی باختین، لە ساڵەکانی ١٩٢٢ تا ١٩٧٤، ئەندێشەی وی لە

بنەڕەتدا نەگۆڕدرا: تەنانەت رستەگەلێکی تاڕادەیەک یەکسانیش دەبینین کە لە ماوەی پەنجا ساڵدا هەر بە یەک شێوە نووسراون. لە بری پێشکەوتن، رووبەرووی دووبارەبوونەوە دەبینەوە- دووبارە بوونەوەیەک کە زۆربەی کات گشتی نییە و هەر تەنیا تایبەتە: لێکۆڵینەوەیەک کە بەردەوام سەر لە نوێ دەستپێدەکاتەوە. نووسراوەکانی باختین زۆرتر لە توخمەکانی سیستەم و کۆیەک دەچن تا لە هۆکارە پێکهێنەرەکانی بینایەک کە پەیتا پەیتا بیچم دەگرێ: هەر کام لەمانە، بەشێوەیەک هەڵگری کۆی هزر و ئەندێشەی وین، بەڵام هاوکات بەشێوەیەکی هەستپێنەکراویش دەست دەکەنە جێگۆڕکێ و چوونە سەر بابەتێکی دیکە و زۆربەی کات هەر ئەم بابەتەیە کە گرنگایەتییەکی بەرچاوی خستۆتە پاڵ ئەندێشەکەیەوە.

هەر بەم بۆنەشەوە، من لە گوزارشی ئەندێشەی باختیندا، رەوتی مێژوویی ئەوم لە پێش روانگەی ئەو سیستەمە فیکرییەوە داناوە و هاوکات لە دوو ئاراستەوە تەماشای دەکەم: سەرەتا سەبارەت بەو بابەتەی کە گۆڕانکاریگەلێک لە بیروڕای باختیندا رووی داوە، بەتایبەت لەبەرودوایی لێکۆڵینەوە لەم بابەتانە،: ئاخێزگەی من زیاتر پرسە ڕێبازناسانەکانەو پاشان دێمەوە سەر تیۆرییەکەی وی دەربارەی گوزارە و دواییش باسی دەورەی وی دەکەم لە مێژووی ئەدەبدا. ئەم جێگۆڕکێ و گۆڕانە لە تیۆرییەوە بۆ مێژوو، تایبەتمەندیی بەرچاوی باختین -ە. بۆخۆشی دەڵێ: "هیچ پرسێکی تیۆریک چارەسەر ناکرێت جگە لەسەر بناغەی بەستێنێکی مێژوویی بەرهەست." ئەمەش لانی کەم دووجار لە رەوتی بەرهەمەکانیدا سەر لە نوێ دەدۆزرێتەوە: توێژینەوە فەلسەفی و تیۆریکەکانی بیستەکان،



لە ١٩٢٩دا دەبێتە هۆی نووسینی کتێبێک دەربارەی نووسەرێکی بێ وێنە: داستایۆڤسکی.

گشتیکردنەوە بەربڵاوەکانی باختین دەربارەی مێژووی رۆمان کە لە سییەکاندا هاتنە گۆڕێ، دەبنە هۆی بەرهەمهاتنی دوو کتێب دەربارەی گوتە (١٩٣٨)و رابلێ (١٩٤٠). لە کۆتاییدا دەستەکەم بەلێکۆڵینەوە لە بابەتێکی تێروتەسەل کە لەسەرتاسەری بەرهەمەکانی باختیندا وەبەرچاو دەکەوێ و، بەباوەڕی من، بناخەی ئاییینی توێژینەوەکانی ئەو پێکدەهێنێ.

کەواتە ئەو چوار ئاقارەی یەک لەدوای یەک دەستەکەمە لێکۆڵینەوەیان بریتین لە: زانستناسی، ئەوپەڕ- زمانناسی; مێژووی ئەدەب و مرۆڤناسیی فەلسەفی. بەڵام لە هەمان کاتدا دەبێ ئەوەشمان لەبیر بێ کە دابەشکاریی واتایی بەهەمان رادەی دابەشکاریی کاتی ڕێژەییە: زانستناسیی باختین لەسەر تیۆرییەکەی وی دەربارەی زمان دامەزراوە؛ مێژووی ئەدەبی، باختین دەگەیێنێتە وردبوونەوەی مرۆڤناسانە و، هەروەهاش لۆژیکی وتوویژ واتای سەرەکی و زاڵی هەموو ئەو بابەتانەیە کە لێیان دەکۆڵێتەوە.

## (٣)
# باختین: پێشەنگی زمانناسیی کۆمەڵایەتی

ڕۆمەن یاکوبسن

ئەم بابەتە وەرگێڕانی پێشەکییەکەی یاکوبسن-ە لەسەر کتێبی *مارکسیزم و فەلسەفەی زمان*، کە بەرهەمی باختین/ڤۆلۆشینۆڤ-ە. ناوی ئەم پێشەکییە لەلایەن وەرگێڕی فارسییەوە هەڵبژێردراوە.

لە کتێبێکدا کە بە واژۆی و.ن. ڤۆلۆشینۆڤ و لە لینینگراد لە دوو چاپی یەک لە دوای یەک (١٩٣٠-١٩٢٢) بەناونیشانی *مارکسیزم و فەلسەفەی زمان* (*Marksizm I Filosofiya Azyka*) بڵاوبۆتەوە، هەموو شتێ هەر لە هەمان لاپەڕەی یەکەمەوە بەتەواوی جێی سەرسووڕمانە.

لە ئاکامدا دەرکەوت کە ئەم کتێبە و چەند بەرهەمی تر کە لە کۆتایی ساڵەکانی بیست و سەرەتای ساڵەکانی سی بەناوی ڤۆلۆشینۆڤەوە بڵاوبوونەتەوە، لەوانە کتێبێک سەبارەت بە



ئامۆژگاریی فرۆید (١٩٢٧) و چەند وتارێک دەربارەی زمان لە ژیان و شیعردا و هەروەهاش سەبارەت بە بنەمای گوزارە، لە راستیدا لەسەر دەستی باختین (١٨٩٥-١٩٧٥) نووسراون کە نووسەری کۆمەڵێ بەرهەمی بڕیاردەر دەربارەی تیۆریی ئەدەبیی داستایۆڤسکی و رابلێ-یە. وا دێتە بەرچاو کە باختین لایەنگریی لە هەندێ رستەسازیی باوی ئەو سەردەمە و بڕێ لە دووگمە سەپێندراوەکانی سەر نووسەرانی ئەوسای نەدەکرد و بە وردی خۆی لێ دەپاراستن. قوتابیان و هۆگرانی ئەم توێژەرەوە، بەتایبەت و. ن. ڤۆلۆشینۆڤ (لە ١٨٩٥دا لە دایکبوو و لە کۆتایی ١٩٣٠ لە چاو ونبوو)، گەیشتە ئەم قەناعەتەی کە بەناوێکی خوازراوەوە کە بە وردی دەیان پاراست و هەروەهاش لە رێگەی هەندێ دەستێوەردانی بەناچاری لە دەق و ناونیشانەکەیەوە، ببنە هۆی رزگاربوونی هەندێ بەشی سەرەکیی ئەم بەرهەمە نایابانە.

خاڵێکی دیکەش کە رەنگە ببێتە هۆی واق وڕمانی ئەو خوێنەرانەی کە زۆرتر لە مێژووی ئەندێشەی زانستی، ئاگاداری مێژووی تاریککردنەوەی زانیارین، لە ناوچوونی نێوی ئەم توێژەرەوە بەرچاوەیە لەسەرجەم چاپەمەنییە رووسییەکاندا بۆ ماوەی نزیکەی چارەکە سەدەیەک (تا ١٩٦٣). هیچ ناونیشانێکیش لە کتێبەکەی دەربارەی فەلسەفەی زمان لەم ماوەیەدا لە ئارادا نییە جگە لە چەند ئاماژەیەک لە هەندێ شیکاریی زمانناسانەی رۆژئاواییدا. بەم دواییانە هەندێ گوتەو گێڕدراوەی ئەم بەرهەمە لە چەند بەرهەمێکی سۆڤیەتدا کە ئەژماریان زۆر لە خوارەوەیە هێنراونەتەوە (وەکو کۆمەڵە وتارێک بەبۆنەی رێزگرتن لە حەفتاهەمین ساڵەهاتی لە دایکبوونی باختین لە هەزار و پێنج سەد دانە- ١٩٧٣).

کتێبی بەردەست لە کۆمەڵە بەرهەمی (Jaeman Linguarum)، لاحە- پاریس، ١٩٧٢) چاپکراوە و وەرگێڕدراوەتەوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی (نیۆیۆرک، ١٩٧٢). هەڵبەت ئەم بەرهەمە و زۆربەی شاکارەکانی دیکەی ئەندێشەی تیۆریکی رووسیا لە ماوەی نێوان دوو شەڕی جیهانیدا، هێشتاش تارادەیەک بە تەواوی لەبەردەستی خوێنەرانی نیشتەجێی سۆڤییەتدا نیین.

سەرەڕای هەموو ئەو شتە سەیرانەی سەبارەت بە بەسەرهاتی ئەم کتێبە و نووسەرەکەی باسی لێوە دەکرێ، تازەیی و رەسەنایەتی ناوەڕۆکی  کتێبەکەیە کە زۆرتر بۆتە هۆی داچڵەکانی سەر لەبەری ئەو خوێنەرانەی کە خاوەنی زەینییەتێکی کراوەن. ئەم بەرهەمە، کە ناوە لاوەکییەکەی *پرسە سەرەکییەکانی رێبازی کۆمەڵناسانە* لە *زانستی زماندا*یە بەپێشەنگی دەستکەوتە هەنووکەییەکان ئەمڕۆ لە بەستێنی زمانناسیی کۆمەڵایەتی لە قەڵەم دەدرێ، بەتایبەت وەپێش تویژینەوە نیشانەناسانەکانی ئێستاش دەکەوێ. لێکدانەوەی **دیالێکتیکی** نیشانە و نەخاسما **نیشانەی گوتەیی** لەم کتێبەدا، لە ژێر تیشکی مشتومڕە نیشانەناسانەکانی ئێستا گرنگایەتی خۆی پاراستووە و تەنانەت بایەخێکی زۆر سوودبەخشیش بۆ خۆی دەستەبەرئەکا.

داستایۆڤسکی پاڵەوانی هەڵبژێردراوی باختین-ە. ئەو وەسفەی کە باختین لەوی دەیدا بەدەستەوە، لە هەمان کاتدا، راستترین پێناسەیە بۆ رێبازی زانستی و شیاوی تویژەرەکان: **هیچ شتێ لەروانگەی ئەوەوە تەواوبوو نانوێنێ: هەموو بابەت و پرسەکان بەردەوام کراوەن؛ بەبێ تاقە ئاماژەیەک بۆ چارەسەرییەکی رەها.** بەبیروڕای باختین، لە بنەمای زماندا، سەرجەم چەمکە سەرەکییەکان، سیستەمێکی لەرزۆک پێکدەهێنن کە لە کۆمەڵێ دوانەی جیانەکراو و



قاییم چێکراوە: تێگەیشتن و ناسینەوە، ناسین و گۆڕینەوە، وتوویژ و تاکبێژی، خواست و ئەگەری ناوەکی و ئەگەری دەربڕاو، هاوگوتاریی نێوان نێرەر و وەرگر، نیشانەی واتادار و واتای سەر بەنیشانە، یەکبوون و جۆراوجۆری، گشتی و تایبەت، کۆمەڵایەتی و تاکەکەسی، بەردەوامی و دابەشکراوی، گوزارەسازی و گوزارە.

ئەوەی سەرنج و ئەندێشەی خولقێنەری خوێنەر زۆرتر رادەکێشێ دواهەمین بەشی کتێبەکەیە کە لەوێ، نووسەر، دەربارەی دەوری سەرەکی و جۆراوجۆری گێڕدراوەکان- ئاشکرایان نائاشکرا- لە گوزارەکانی ئێمەدا دەستدەکا بەباس و، رێگەگەلێکی جیاجیای لێکداوەتەوە کە بۆ داپۆشینی ئەم وەڵامە جۆراوجۆر و بەردەوامانە بەسەر بەستێنی گوتاردا بەکاردەهێنرێن.

## (٤)
## باختین: بنیاتنەری پاش فۆرمالیزم

ژولیا کریستاڤا

ئەم نووسینە وەرگێڕانێکی بەشێکی لێدوانەکەی ژولیا کریستڤایە لە ئەنجومەنێکدا کە لە ئەپریلی ١٩٧٠ بە ناوی **ئەدەب و ئایدیۆلۆژییەکان** لە فەرەنسا بەڕێوەچوو.

لوکاچ لە دووتوێی هۆشیاریی چینایەتی پرۆلتەریاییدا، چەمکی ئەدەب وەکو "ناسینی گشتێتی واقیع" دێنێتە نێو رەخنەی ئەدەبی مارکسیستیەوە و، وەها روانینێک هەمان کاربردی سەر لە نوێی گشتێتی هێگلییە. بەلام بەبیروڕای من دەبێ ئەم گۆڕانکارییە هێگلییەی لوکاچ لەسەر زەمینەی کانتخوازییە پێشووەکەی لێکبدرێتەوە، چونکە کتێبی رۆح و شێوەکان (١٩١٠) کە بەر لە روانگە هێگلییەکانی لوکاچ نووسراوە، بیروبۆچوونی کانتی تێدایە. لەلایەکی ترەوە، ئەم چەشنە لایەنگرییە هێگلیانەی لوکاچ لەگەڵ لایەنگرییە سیاسییەکانی نێو مارکسیزم و دژی سۆسیال دیموکراسیی ئەڵمان هاوکات بوو. کەواتە بەشێکی زۆری ئەو رەخنانەی کە لوکاچیان بەهۆی چوون بە دوای هێگڵدا سەرکۆنە دەکرد، لە ئاقاری تیۆریکدا لە فەلسەفەی نوێی کانتییەوە سەرچاوەیان دەگرت و لە



بەستێنی سیاسیشدا لەو سۆسیال- دیموکراسییەوە هەڵقوڵابوون کە لە ئاکامدا بەسەر ئەنترناسیۆنالی دووهەمدا زاڵبوون.

بەبیروڕای من، ئەم ئایدیۆلۆژیا نوێ- کانتییە بناغە و سەرەتای چەمکی "ئەدەبییەت"ە کە فۆرمالیزمی رووسی ئاراستەی کرد و ئەمڕۆکەلە فەرەنسا لە هەندێ ;ە تیۆرییەکاندا زۆر باوە.

دەوری رێبازی نوێ کانتی لە بیچمگیریی ئایدیۆلۆژیای فۆرمالیستیی ئەدەبدا دەبێ وردتر هەڵبسەنگێندرێ. هەر لەسەردەمی بیچمگیریی فۆرمالیزمدا، سێ روانگە لە سۆڤیەتدا دەستیان کرد بە رەخنە لێگرتنی. لێرەدا دەچمە سەر وەبیرهێنانەوەی ئەم سێ جۆرە رەخنەیە کە لەوانەیە سوودی زۆری بۆ بارودۆخی هەنووکەیی هەبێ.

لەلایەکەوە رەخنەکەی ترۆتسکی لە کتێبی *ئەدەب و شۆڕش (١٩٢٣)*دا: ترۆتسکی گرنگایەتی رەخنەی فۆرمالیستی و رووبەڕووبوونەوەی زمانناسانە بۆ دەقە ئەدەبییەکان پەسەند دەکات، بەلام پێگەی سنووورداری چەشنێ رەخنەی پەراوێزیش رەچاو دەکات کە رەنگە تیۆرییە مارکسیستییەکانیش هەر تەنیا بەخستنە سەری رەهەندی کۆمەلایەتی- مێژوویی بەم رەخنەیە بە کاری بهێنن. ئەم جۆرە زۆرینەخوازی و تێکەلاوییە کە ئەگەری بەدیهاتنی بەهۆی جیاوازیی بناخە تیۆریکەکانی ئەم دوو گەڕیانەوە (فۆرمالیزم و کۆمەڵناسیخوازی) روون و ئاشکرا نییەو، لە ئەنجامدا دەگاتە دابەزاندنی روانینی زمانناسانە لە ئەدەبەوە بۆ بەشێکی هونەریی نێو کەمپی تیۆریی مارکسیستیی ئەدەب، کە ئەمەش ئاکامەکەی بریتی بوو لە وەلانانی سەرجەم لایەنە تەواو نوێخوازانەکان لە روانینی فۆرمالیستیدا، واتە سەرنجدان بە ماددیەتی زمانیی دەقی ئەدەبی لە پێگەی سیستەمێکی ماناداری تایبەتدا. ئەم روانگە تێکەلاو و زۆرینەخوازە- کە باربریس پێی وایە هەندێ لەو

خوازیارییانەی خۆیان بەمۆدێرن دادەنێن هۆگرێ ئەم روانگەیەن- بەدڵنیاییەوە ناتوانێ هەمان روانگەی ئێمەش بێ.

دووهەمین رەخنە لە فۆرمالیستەکان لەسەر بناخەی روانگە کۆمەڵناسانە جەماوەرییەکان هاتوتە کایەوە. تاقمێ لە کۆمەڵناسان رەخنەیان لە فۆرمالیزم دەگرت کە لەبەرچی خۆی لە ئاقاری زماندا بەند کردووە. ئەوانیش، لەلایەکی ترەوە، بەجۆرێ ئەدەبیان- تەنانەت بەبێتێپەڕبوون لە نێوەنجی شێوەکانی هۆشیاری کە لە تیۆریی هێگلی یان کانتی و بەتایبەت لوکاچیدا لە گۆڕێدایە- دادەبەزاندە سەر پرسە چینایەتییەکان. سێهەمین رەخنە کە بەبیروڕای من لە هەموویان گرنگترە و بەپێشەنگی بزاڤی هەنووکەیی نیشانەناسی دەژمێردرێ، رەخنەی ئەو پاش فۆرمالیستانەیە کە لە دەوری باختین، ڤۆلۆشینۆڤ و مێدڤێدوڤدا بووبوونەوە. بەرهەمەکانی ئەوان بەراستی و لە کردەدا لە فەرەنسا نەناسراوە، بەڵام وەرگێڕانی فەرەنسی کتێبەکانی باختین بەخێراییەوە خەریکە ئەنجامدەدرێ[1]. رەخنەگرانی پاش فۆرمالیست خوازیاری گۆڕانێک لە فۆرمالیزم و چەمکی ئەدەبییەت بوون، گۆڕانێک کە ئەگەرچی هۆگری مانەوە لە ناوەوەی فۆرمالیزمدایە- واتە بەپەسەندکردنی هەندێ دەستکەوتی فۆرمالیستی لە بەستێنی شێوەی کارکردی زمانیی دەقەکان- بەڵام خوازیاری چوونە نێو کەمپی مارکسیزم بوون. ئەم دەست تێوەردانەی پاش فۆرمالیستەکان زیاتر لە دوو خاڵی سەرەکیدا هەستپێدەکرا.

١. پۆلینکاریی دووبارەی چەمکی زمان. بەبیروڕای باختین و تیۆری داڕێژەکانی دیکەی ئەنجوومەنەکەی، نابێ نموونە تایبەتییەکانی بابەتی زمان لە روانگەی زمانناسی (بنەمایی یان هەر چەشنێکیتر)ەوە بۆ بەدەقی ئەدەبیش بەکاربرێ، چونکە ئەم بابەتە (زمان)



دەرهەستکارییەکی زانستییە کە کارکردی واتادار و ئاڵۆزی دەقە ئەدەبییەکان لە بەرچاو ناگرێ. بەمەبەستی چارەسەریی کەموکوڕییە تایبەتەکانی چەمکی زمان- ئەو کەموکوڕییانەی کە لە ئاقاری تایبەتی زماندا بە تەواوی رەوان- دەبێ دوو رەهەندی سەرەکی تێیدا رەچاو بکرێ: لەلایەکەوە ئەو کارایەی کە قسە دەکات و، لەلایەکی ترەوە، ئایدیۆلۆژی. لێرەدا "کارا" نابێ بەوێنەی دادکارییەکی زمانناسانە رەچاو بکرێ، چونکە لێرەدا مەبەست لە کارا، بێژەری قسەکەیە. ئەو کارایەی کە تەنانەت بە هێنانە ئارای "ئەویدی"ی خۆیەوە دووفاقەی لێ دەردێ (بێژەر و بیسەر). هەڵبەت لەم نێوەندەشدا هیچ چەشنە لاکردنەوەیەک بەلای تیۆریی فرۆیدی- کە لەوکاتەدا لەبەردەستی ئەم تیۆری داڕێژانەی سۆڤییەتدا نەبوو- لە ئارادا نییە. کاتێ کە ئەمڕۆکە دەقەکانی ئەم پاش فۆرمالیستانە دەخوێنینەوە، کاریگەرێتی و گرنگایەتی تیۆرییەکانی فرۆید دەربارەی خودی ناهۆشیار- یان تەنانەت بەو شێوەیەی بەم دواییانە لێکدراونەتەوە، پێشوەخت هەست پێدەکەین، چونکە لە واقیعدا لەبەرهەمی ئەم پاش فۆرمالیستانەدا تەقەلایەکی دووفاقە وەبەرچاو دەکەوێ: یەکەم، چوونە ئەوپەڕی نواندنەوە کە بەدوای پێویستیی کارایەکی پاڵەکی لە ئایدیۆلۆژیای فۆرمالیستیدایە و، دووهەم، ئاراستەکردنی مانا وەکو ئەو ئاقارەی کە لەوێ "من" لە گرێ خواردن بە "ئەویدی"یەوە بیچم دەگرێ، بەشێوەیەک کە، بەوتەی ژاک لەکان، دەکرێ لەم "ناوچە قەدەغەکراوە"دا لە کاریگەرییە جیاوازەکانی دابەشبوونی زەینییەت تێبگەین.

٢. هەوڵێک بۆ ئایدیۆلۆژیابارانکردنی چەمکی دەق بەبێ دابەزاندنی دەق بەواتای زمان بە وێنەی بارگاوی بوونی ئایدیۆلۆژیک. کەواتە، زمانی هەر دەقێک تەنیا مانایەکی دەرهەستی نییە و بەڵکو لە هەمان کاتدا، هەڵگری جۆری ئایدیۆلۆژیاشە. لێرەدا پەنجە دەخەمە سەر دەقێک

لە یەکێ لەم پاش فۆرمالیستانەی سۆڤییەت، واتە میدمیدۆڤ، کە خوازیاری پۆلینکاریی چەمکی زمانە بەشێوەیەک کە ئەم چەمکە بتوانێ هاوکات زمانناسانە و ئایدیۆلۆژیک بێ و، **ماناش**، بەو چەشنەی زمانناسی باسی لێدەکا، لەگەڵ **ئایدیۆلۆژیادا**، بەو جۆرەی مەبەستی ئەو تیۆریانەیە کە لەسەر مێژوو دامەزراون، ئاشتبکاتەوە. میدمیدۆڤ دەڵێ:

*دۆزینەوەی چارەسەریی راستەقینە پێبەندی ئەوەیە کە لەبەرهەمی ئەدەبیدا هۆکار یان فاکتەرێک بدۆزینەوە کە هاوکات لە واقیعی بابەتیانەی وشە و لە ماناکەشیدا بەشدار بێ. ئەمەش ئەو هۆکارەیە کە، لە پێگەی نێوەنجدا، قووڵایی و گشتێتی مانا بە یەکێتی گوزارەکەیەوە گرێ دەدا، ئەم نێوەنجە لە نێوان شێوەی دەرەکی و مانای ئایدیۆلۆژیکدا سەر لەبەری گوزارە رێژەییەکان لە باری کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە مانادار دەکاتەوە، بە شێوەیەک کە لە وتەزای واقیعی سروشتییەوە بۆ وتەزای واقیعی مێژوویی تێدەپەڕن. مانای واژەیەکی دەربڕاو، هەر تەنیا ئەگەر بێتەدی، لەمێژوودا بەشداریدەکا و دەبێتە بابەتێکی مێژوویی.*

بەم شێوەیە پاش فۆرمالیزم پیشاندەری دوو لایەنی گۆڕانکاری لە چەمکی **ئەدەبییەت** دایە: لەلایەکەوە رەچاوکردنی پێگەی کارا لە گوتاردا و بیچمگیریی کارا لە پێوەندیی بە ئەویدییەوەو، لە لایەکی تریشەوە، رەچاوکردنی ئایدیۆلۆژیا وەکو توخمی جەوهەریی مانا، هاوکات لەگەڵ خۆ دوورخستنەوە لەو ڕێبازە پۆزەتیڤیستییەی کە گەرەکییەتی بەهەر جۆرێک بووە دەقی ئەدەبی بۆ هەندێ نموونەی وردی بڕوا پێکراو و بۆ بابەتی **زمان**، بەشێوەیەی لە زمانناسیدا باسی لێدەکرێ، دابەزێنێ.



## (٥)
## دەوری باختین لە پەرەپێدانی ئاقاری کۆمەڵناسیی ئەدەبدا

لوسیەن گۆڵدمەن

ئەم بابەتە دوابەشی وتارە بەناوبانگەکەی گۆڵدمەن-ە
بە ناوی " کۆمەڵناسیی ئەدەب، پێگەو پرسەکانی ڕێباز".

بۆ تەواوکردنی ئەم وتارە پێشەکیئاسایە دەمانەوێ ئاماژە بۆ یەکێ لە بڕگەکانی پەرەپێدانی توێژینەوەکانمان بکەین کە تاکو ئێستا بەکارمان نەهێناوە. بەڵام ماوەیەکە، دوای ئەوەی کە لێکدانەوەکەی ژوولیا کریستاڤا دەربارەی باختین لە گۆڤاری کریتیکدا بڵاوکرایەوە، ئێمەش بەکارهێنانی ئەم ڕێبازەمان هەر لە مێشکدا بووە.

بەبێ ئەوەی لەم وتارەی بەردەستدا بەشێوەیەکی ئاشکرا وتبێتمان، دیارە لە ژێرخانی سەرجەم توێژینەوەکانی ئێمەدا واتایەکی دیاریکراو لە بایەخی جوانیناسانە بەشێوەیەکی گشتیو لە بابەتی ئەدەب بەشێوەیەکی تایبەتی لە ئارادایە. ئەم وتارەش باس لە هەمان ئەندێشە دەکات کە لە جوانیناسیی کلاسیکی ئەڵمانیا و لە کانت و لە

ڕێگەی هێگل و مارکسەوە تا لوکاچی لاو پەرەی سەندووەو، بەو پێیە بایەخی جوانیناسانە برێتییە لە جۆرێ تەنشتی چارەسەرکراو لە نێوان جۆراوجۆری و چەندفاقێتی و لێواولێویی هەستپێکراو لەلایەکەوە و ئەو یەکێتییەی کە ئەم جۆراوجۆرییە چەندفاقەیە لە کۆمەڵەیەکی یەکگرتوودا ڕێکدەخات و بیچمیان دەداتێ. لەم ڕوانگەیەوە بەرهەمی ئەدەبی کاتێ بایەخدارتر و گرنگترە کە ئەم تەنشتە هاوکات بەهێزتر بێ و بەجۆرێکی کاریگەرتر چارەسەر کرابێ. ئەمەش واتە پڕی و چەندفاقێتی هەستپێکراوی جیهانەکەی، بەربڵاوتر بێ و هاوکات ڕێکۆپێکی و بیچمی وردتریشی هەبێ و، لە ئاکامدا چەشنێ یەکیەتی بنەمایی ڕێک بخات.

ئێستا کە ئەم خاڵەمان لێ ڕوون بۆوە لەمەشدا گومانێک نییە کە تارادەیەک سەرجەم بەرهەمەکانی من و تەنانەت کاری ئەو تویژرەوانەش کە لە نووسینەکانی لووکاچی لاوەوە سرووشیان وەرگرتووە، توێژینەوەکەی خۆیان لەسەر تەوەرەیەک لە توخمەکانی ئەم تەنشتە، واتە لەسەر یەکیەتی، دامەزراندووە و ئەوەشیان دەستنیشان کردووە کە لەواقیعی ئەزموونیدا یەکیەتی وەکو بنەمایەکی مێژوویی واتادار و یەکگرتووی دەکەوێتەروو کە بنیاتەکەی لە هەڵسوکەوتی هەندێ تاقمی کۆمەڵایەتی بەرچاودایە. سەرومڕی توێژینەوە کۆمەڵناسانەکانی ئەدەب لەم قوتابخانەیەدا تاکو ئێستا لە یەکەم هەنگاودا تەنیا سەرنجیان داوەتە ڕوونکردنەوەی ئەو بنەما یەکگرتوو و یەکپارچانە کە بەسەر جیهانێکی گشتگیردا زاڵن و، بەپێی وتەی دانەرەکانیان، سەرجەم بەرهەمە ئەدەبییە گرنگەکان لە خۆ دەگرن.



ئەم توێژینەوانە- هەروەها کە پێشتر وترا - تەنیا بەم دواییانە یەکەم هەنگاوەکانی خۆی بەرەو لای ناسینی پێوەندیی بنەمایی نێوان جیهان و شێوەیەک کە دەریدەبڕێ، هەڵگرتووە. سەرەڕای هەموو ئەمانە، لە سەرجەم ئەم توێژینەوانەدا، جەمسەرێکی دیکەی تەنشتەکە، واتە چەندفاقێتی و لێواولێوی تەنیا وەکو دادەیەک پەسەندکراوە کە ئەگەر ئەمەش پێوەندیی بەبەرهەمێکی ئەدەبییەوە هەبێت، لە چەند فاقێتی و جۆراوجۆریی کەسە زیندووەکانی سەرچاوەی گرتووە و هەندێ جاریش لە چەند وێنەیەکی تاکەکەسییەوە دێتە بەرهەم. ئەم بابەتەش جیاوازیدانانی نێوان ئەدەب و فەلسەفەی هێناوەتە دی کە هەندێ جیهانبینیی چونیەک لە ئاقاری چەمکە گشتییەکاندا دەردەبڕن. لێرەدا نەک شانۆنامەی *مەرگ* لە گۆڕێدایە و نەک لە *فاوست*ی بەرهەمی گوتەدا خراپەیەک دەدۆزرێتەوە، بەڵکو هەر تەنیا "فدری مردوو" و کەسایەتی تەواو تاکەکەسیکراوی "مێفیستۆفێلس" ئامادەبوونیان هەیە. لە بەرامبەر ئەم ڕوانگەیەدا، لە بەرهەمەکانی پاسکاڵ یان هێگلدا نەک هەر کەسایەتییە تاکەکەسییەکان، بەڵکو "خراپە" و "مەرگ"یش دەدۆزرێتەوە.

سەرەڕای ئەمەش، لە ڕەوتی بەدواداچوونی توێژینەوەکانی خۆمان لە ئاقاری کۆمەڵناسیی ئەدەبدا بەشێوەیەک هەڵسوکەوتمان کردووە کە دڵێی بوونی فدر یان مێفستۆفێلس واقیعێکی دەرەکی لە بەستێنی گونجاوی ئەم زانستەدا بووەو تایبەتمەندیی کەم و زۆر زیندوو و دیاریکراوی ئەم کەسایەتیانە لایەنێکی تاکەکەسی لە داهێنانی هونەری بووە کە پاڵپشتەکەی لە یەکەم قۆناخدا بەهرە و دەروونناسیی نووسەرەکە بووە.

ئەندێشەکانی باختین، بە بڕوای مە و بەو چەشنەی کە کریستاڤا وەسفییان دەکا وبە پێی ئەو شکڵ و بیچمەی لەکاتی دەربڕینی هەڵوێستە تایبەتەکانی خۆیدا دەیان داتێ، بەستێنێکی بەربڵاوی تازە و تەواوکەر بۆ توێژینەوەی کۆمەڵناسانە سەبارەت بەئافراندنی هونەری سازدەکەن.

هەر بەهەمان شێوە کە ئێمە لە لێکدانەوە دیاریکراوەکانی خۆماندا تارادەیەک لەسەر جیهانبینی و یەکگرتوویی و یەکیەتی بەرهەمی ئەدەبی راوەستاوین، کریستاڤاش لە لێکدانەوە شیکارانەکەی خۆیدا رەهەندەی بنەمای زەینی بەشێوەیەکی راستەقینە دەخاتە پاڵ کار و کردە بەکۆمەڵەکان و هەروەهاش رەهاگەری و سەرکوتکارییەوە. کریستاڤا پێ لەسەر بەرەو پرسیاربردنەوەی ئەم رەهەندە دادەگرێ و گرنگی دەداتە ئەوەی کە لەهەمبەر یەکێتیدا دێتە ئاراوە و پێی وایە رەهەندێکی رەخنەگرانە لە خۆ دەگرێ (ئێمە وای بۆ دەچین کە لێرەشدا دیسانەوە ئەو راست دەڵێ). بەڵام بەبیروڕای ئێمە وا دێتە بەرچاو کە هەموو لایەنەکانی بەرهەمی ئەدەبی کە باختین و کریستاڤا روونیان کردووەتەوە بەتەواوی لەو جەمسەرە پڕو چەندفاقەیە دەچێ کە بۆچوونی کلاسیکی دەربارەی بایەخی جوانیناسانە هەیەتی.

ئەم وتەیە بەو مانایەیە کە، بەبیروڕای ئێمە، کریستاڤا لە ئافراندنی کولتووریدا - بەر لەهەر شتێک- هەر تەنیا دەوری بەرهەستکارانە و چەندفاقێتی ئەو ئافراندنە دەبینێ (یان، بەپێی وشەکانی خۆی، "وتووێژ" لە هەمبەر"تاکبێژی"دا تووشی یەکلابینی دەبێ). بەڵام ئەوەی ئەو مەبەستییەتی و شیدەکاتەوە نیشاندەری رەهەندێکی واقیعی هەر بەرهەمێکی ئەدەبی و گرنگە. جگە لەمەش، کریستاڤا



بەپیشاندانی پێوەندیی نێوان جیهانبینی و ئەندێشەی واتای یەکگرتوو و رەهاگەری، بەشێوەیەکی پاڵەکی بۆتە هۆی راکێشانی سەرنجی زۆرتر بەتایبەتمەندییە کۆمەڵناسانەکانی نەک هەر ئەم هۆکارانە بەڵکو ئەوانەش کە رەتیدەکەنەوە و دەیخەنە بەر رەخنە و, یان حوکمی نەمانی بەسەردا دەسەپێنن.

بە رەچاوکردنی ئەم ئەندێشەگەلە و ئەو سەرنجانەی تا ئێستا ئاراستەمان کردوون، دەگەینە ئەم خاڵە کە تاڕادەیەک سەرجەم بەرهەمە ئەدەبییە مەزنەکان روانگەیەکی رەخنەگرانەیان هەیە چونکە بەهۆی ئافراندنی جیهانێکی پڕ و چەندفاقە - جیهانێک کە یەکگرتوویی بنەمایی تێدایە و جیهانبینەکەشی دیاریکراوە- کەسایەتییە تاکەکان و پێگە تایبەتەکان دەستدەکەن بە وێناکردنی ئەو پێگانەی کە مەحکوومی دەکەن. بەمەبەستی ئەوەش کە ئەو کەسانەی هێمای ئەم پێگانەن زیندوو و راستەقینە بنوێننەوە، ناچارن سەر لەبەری ئەو لایەنە نامرۆییانەی کە بەکەڵکی روانین و هەڵسوکەوتی ئەوان دەربڕاوە، بدرکێنن.

ئەم وتەیە بەو مانایەیە کە ئەم بەرهەمانە، تەنانەت سەرەڕای ئەوەش دەربڕی جیهانبینییەکی تایبەتن، لەبەر هەندێ هۆی ئەدەبیی جوانیناسانە بەناچار ئەو روانین و بەها مرۆییانەش کە دەبێ بۆ بەرگری و لایەنگریکردنی جیهانبینییەکەیان قوربانی بکرێن دەردەبڕن و دەیان خەنەروو.

کەواتە، بێگومان لە ئاقاری شیکاریی ئەدەبیدا لە رێگەی روونکردنەوەی سەرجەم لایەنە لێکدژەکانی بەرهەمەوە- کە پێویستە روانینێکی بنەمادار بەسەریاندا زاڵبێ و تەکووزی و بیچمیان بداتێ- دەکرێ زیاتر لەوەی تاکو ئێستا ئێمە ئەنجاممانداوە، بچینە پێشەوە.

هەندێ لەم هۆکارانە خاوەنی سروشتێکی بوونناسانەن، بەتایبەت مەرگ، کە بۆ هەموو جیهانبینییەکان لە پێگەی وزەیەکدایە بۆ مانادان بەژیان و بەدژوارییەکی گرنگ دەژمێردرێ. هۆکارەکانی تر، سروشتێکی زیندەوەرناسانەیان هەیە، وەک "مایەی ژیان" (لیبیدو) یان سەرجەم ئەو بابەتە بەرەو پاشکەوتانەی کە دەروونشیکاری دەیان خاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە. بەڵام، ژمارەیەکی تاڕادەیەک بەربڵاو لەو هۆکارانە کە سروشتێکی کۆمەڵایەتی و مێژووییان هەیە لە گۆڕێدان. هەر بەم بۆنەشەوە کۆمەڵناسی لەم بەستێنەدا دەتوانێ زۆر کاریگەر بێ و ئەوە پیشان بدا بۆچی نووسەرێک، لە دۆخێکی مێژوویی تایبەتدا، لە نێو ئەو ژمارە زۆرەی وێنای پێگەکان و روانینە جیاجیا لێکدژەکان کە مەحکوومیان دەکات، تەنیا ئەوانە هەڵدەبژێرێ کە زۆر گرنگن.

واتای سەرەکیی تراژیدییەکانی راسین ئەوەی بە "وەحشییەکان"ی دیلی شەهوەت ناوزەدمان کردن و ئەو "گێلە پیاو"انەی کە بەردەوام دەربارەی واقیع تووشی هەڵە دەبن، بەتوندی رەت دەکاتەوە. بەڵام وەبیر هێنانەوەی ئەم خاڵە دووبارە کردنەوەی بابەتێکی ئاشکرایە کە واقیعی بەهای مرۆڤانەی ئورێست، هێرمیۆن، ئیگریپین، بوتیانیکووس، ئالنتۆ فروس، هیپۆلیت, یان تیزە، تا چ رادەیەک لە تراژیدیاکەی راسیندا وێنا کراوەتەوە و دەقەکەی راسین تا چ ئاستێک ویست و ئارەزوو و ئازارەکانیان دەردەبڕێ.

سەرلەبەری ئەم بابەتانە شیاوی ئەوەن کە بابەتی لێکدانەوەگەلێکی ئەدەبیی ورد و بەربڵاوبن. هەڵبەت، سەرەڕای ئەمانە، بەبیروڕای ئێمە، مەحاڵ دەنوێنێ شەهوەت و پاوانخوازیی سیاسی لە بەرهەمەکانی راسیندا دەربڕینێکی بەگۆڕتر و وزەدارتر لە چاکەیەکی



هەڵپەسێردراو بۆ خۆی دەستەبەر بکات کە توانای تێگەیشتنی لە واقیع نەبێ. ئەم جیاوازییە بیچمی و شێوەییە لە دەربڕینی ئەدەبیدا ئاکامی واقیعە کۆمەڵایەتی، دەروونی و فیکرییەکانی ئەو کۆمەڵگایەن کە راسین لەوێ ژیاوە، هەروەهاش دەرەنجاکی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییانەن کە تاقمی ژانسێنیستەکان دژایەتیان لەگەڵی دەربڕیوە.

ئێمە پێشتر تیشکمان خستۆتە سەر واقیعی ئەو تاقمە کۆمەڵایەتییانەی کە هارپاگۆن، ژورژداندن، تارتۆف، تالسیست و دۆن ژوون لەبەرهەمەکانی مۆلیر لەگەڵیاندا رووبەڕوو بوونەتەوە (بۆرژوازی، دەستەواژەی "قوربانیی پیرۆز و کۆمەڵەی پیاوچاکان"، ژانسێنیستەکان، ئاغەواتەکانی دەربار کە درێژدادڕی دەکەن، یان واگێنر لە *فاوست*ـی گوتەدا "ئەندێشەی رۆشنگەران").

ئەم لێکدانەوەیە هەر لێرەدا کۆتایی پێدێت. دیارە ئەم دوا پاراگرافە، ئێستا تەنیا بایەخی بەرنامەیەکیان هەیە کە بەدیهاتنی بەندە بەپێشکەوتنە رادیکاڵەکانی توێژینەوە کۆمەڵناسانەکان دەربارەی داهێنان و ئافراندنی کولتووری.

## (٦)
## میخایل باختین و کۆمەڵناسیی ئەدەب

ژان ئێڤ تادیە

دابەزاندنی بەرهەمە زۆر و بەربڵاوەکانی باختین هەر تەنیا بۆ کۆمەڵناسیی ئەدەب کارێکی ناڕاستە: بنچینەی بەرهەمەکانی، بەبیروڕای ئێمە، فرەتر پێوەندیی بە ئاقاری بۆتیقاوە هەیە. لە پاڵ ئەمەشدا زۆرتر پێ لەسەر دوولایەنی ئەو بەرهەمانە داگیراوە. ئەم لایەنانە کە زیاتر لە دوو کتێبی *بەرهەمەکانی فرانسوا رابلێ و کولتووری جەماوەری لە چەرخەکانی ناوەڕاست و ڕۆنیسانسدا* (١٩٦٥، وەرگێڕانی فەرەنسی لە ١٩٧٠) و *بۆتیقای داستایۆڤسکی* (١٩٦٣، وەرگێڕانی فەرەنسی لە ١٩٧٠) دەردەکەون و تەواوکەری بەرهەمەکانی لوسیەن گۆڵدمەن-ن، بریتین لە: گەڕانەوە بۆ کولتووری جەماوەری کە ئاسۆ و کەرەسەکەی ئەم گەڕانەوەیە هەندێ بەرهەمی مەزنە و، هەروەهاش بەرجەستە کردنەوەی جیهانبینییە جیاوازەکان لە جۆرە جیاجیاکانی گوتاردا کە چەشنەکانی ڕۆمان دابەشدەکەن.

لەسەرچاوەی بەرهەمەکانی رابلێدا، ڕووبەڕووی کولتووری جەماوەری دەبینەوە کە لەسەردەمی کەونارا و لە بەرهەمەکانی پترۆن یان ئاریستۆڤاندا لە ئارادایە و لەسەردەمی ڕۆنێسانسدا لە



بەرهەمەکانی بوکاچیۆدا سەر لەنوێ دەردەکەوێتەوە: "کولتووری کۆمیک و جەماوەریی چەرخەکانی ناوەڕاست و ڕۆنێسانس، هەمان سەرچاوەی ڕاستەوخۆ و بێ نێوەنجی بەرهەمەکانی رابلێ بوو."[١]
ئەم کولتوورە جۆرێ جیهانبینیی تایبەت و جیاواز لە ڕوانینی گشتگیر و زاڵ بوو و هاوکات لێواولێو بوو لە شێوەگەلێکی تایبەت. لێکدانەوەی بەرهەمەکانی گوگول لە ڕێگەی "دۆزینەوەی پێوەندیی ڕاستەوخۆی لەگەڵ جێژن و شاییە جەماوەرییەکانی نیشتمان و زێدەکەی" و ئاماژە کردن بۆ جێژن و بازاڕە فریودەرەکانی ئوکراین و ئەو "ڕیالیزمە گرۆتیسکە" کە فەقێ کورتەدەستەکان بڵاویان دەکردەوە، هەرهەموو بەرهەمەکانی گوگول گرێدەنەوە بە بەرهەمەکانی رابلێیەوە. دۆزەخی شاییهێنەری *خووە مردووەکان* (گوگول) لە پێوەندیی ڕاستەوخۆدایە لەگەڵ دۆزەخی شاییبەخشی *چوار کتێب* (رابلێ)، چونکە شەرحی گەڕانێکی "کارناڤێلی" لە وڵاتی مردووەکاندایە. کارناڤێلی کولتووری جەماوەری لەم پێکەنینە "زاڵ بەسەر هەموو شتەکاندا" بەشێوەی "پاڵاوتنی بێشەرمییەکان" دەردەکەوێ و خۆی دەنوێنێ. کەواتە، پرسی کولتوور لە ڕوانگەی باختین-ەوە نە بەشێوەی پێشکەوتنێکی تاکهێڵی و بەردەوام بەڵکو لەرواڵەتی هەستانەوەیەکی وەحشیانە و دڕندانەدا ئاراستە دەکرێ. ئەم کولتوورە، کۆمەڵە و جۆرێ نێوەنجی تەواوکەر پێک دەهێنێ کە دەخرێتە سەر واتای جیهانبینیی بەرباسی لووکاچ و گۆڵدمەن. ئەم نێوەنجەش دەوری سەرەکی دەگێڕێ چونکە بۆ خۆی دیاردەیەکە لە زماندا کە هەڵگری لێکدانەوەی زمانناسانە و ڕەهەندێ ئەدەبییە.

1- *Esthetique et Theorie du Roman.* Gallimard 1978. p. 366. (Moscou. 1975).

لایەنێکی بنەڕەتیی دیکە کە لە ڕەخنەکەی باختین-دا پێوەندیی بەکۆمەڵناسیی ئەدەبییەوە هەیە دەگەڕێتەوە بۆ بنەمای چەند دەنگیی ڕۆمان. ئەم چەشنە ئەدەبییە لە ڕاستیدا دەنگە جیاوازەکان تێکەڵی یەکتر دەکات. باختین لە شیکاریی *ئوگین ئوونگین*دا هەندێ "شێوەی زمانی و شێوازی جیاواز"ی ئەم هەڵبەستە دەستنیشان دەکات کە هی "سیستەمە جیاوازەکانی زمانی ڕۆمان"-ە. ئەگەر ڕۆمان هەڵگری "سیستەمی وتووێژەکان و نواندنەوەی شێوەزارەکان"-ە (ئەو شێوازو تێگەیینە دەرهەست و جیانەکراوانەی لە زماندان)، ئەگەر زمان بەردەوام خەریکی کەڵک وەرگرتن لەزمانی ئەدەبیی سەردەمی خۆیەتی، کەواتە ئەتوانین بڵێین *ئۆگین ئۆنگین* ڕۆمانێکی ڕاستەقینەیە.

ڕۆمان کە "لە ناخی چەشنە (ئەدەبییە) سەر زارەکی‌و باوەکانی زمانی گوتەیی جەماوەردا پەروەردە کراوە،" پێش مێژوویەکی دوورودرێژی هەیە کە لەوێ دەکرێ "دوژمنایەتیی کۆنی عەشیرە و نەتەوەو کولتوور و زمانە جیاجیاکانی ئەمانە" و "پێکەنین" و "چەند زمانی" بدۆزرێتەوە. کەواتە هەر بە هەمان شێوە لە هەڵبەستەکەی پۆشکین‌دا "شێوەی گوتەی هەستیارانە و خەیاڵاویی ڕیچاردسۆن-ئاسای کابانێکی کۆشک نشین لە ڕواڵەتی تاکبێژییەکی ناوەکیدا" دەدۆزینەوە، کە لە "شێوەزاری جەماوەری و ڕەشۆکی و حەقایەتەکانی داپیرە و چیرۆکە سوننەتییەکان، چامە لادێییەکان و تەنانەت پێشبینییە خێڵانەکانیشدا دەبینرێ". تەنانەت بەشە لیریکەکانی ئەم ڕۆمانەش "نواندنەوەگەلی ڕۆمانئاسای شیعر"ن. نووسەر لە ڕۆمانەکەی خۆیدا ئامادە بوونی هەیە، بەڵام تاڕادەیەک بەبێ زمانی ڕاستەوخۆ و تایبەتی خۆی. زمانی ڕۆمان، سیستەمێکە پێکهاتوو لە زمانەجیاجیاکان کە لە وتووێژدا لە هەمبەر یەک دەخرێنەڕوو.



دۆزینەوەی سەرچاوەی کۆمیکی کولتووری جەماوەری لە بەرهەمدا کە بەردەوام و هەتاهەتایە دەمێنێتەوە و دیتنی دەنگە زۆر و جیاوازەکان لە ڕۆماندا، دوو ڕوانگەی یەکگرتووبەرهەمهێنەرن. یەکگرتوون چونکە، بەبیرورای باختین، سەرچاوەی ڕۆمان دەگەڕێتەوە بۆ چەشنە (ئەدەبییە) کۆمیکەکان وەکو هەجوی مێنیپەیی و، بەرهەمهێنەریشن بەو بۆنەوە کە کۆمەڵناسیی ئەدەب ئەوپەڕ یان ئەوبەری زمان شی ناکاتەوە، بەڵکو دەستدەکاتە لێکۆڵینەوە لە بنەما کۆمەڵایەتییەکان لەو ڕووەوە کە قسەی پێدەکرێ و قسەکەشیان دەنووسێتەوە.

# (٧)
# بژاردە بنچینەییەکانی باختین

تێزڤێتان تۆدۆرۆڤ

### ١. هۆکاری تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی:

لە کۆتایی بیستەکاندا، سێ کتێب لە ئەنجوومەنەکەی باختین‌دا بڵاوکرایەوە. ئەم کتێبانە بۆ دەروونناسی، زمانناسی و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی تەرخان کراون و، هەرسێکیان بە شێوازێکی دیالکتیکی نووسراون و پشتیان بەستۆتە مارکسیزم. دژایەتییەک کە بنەڕەتی ئەم دیالکتیکانە و نووسراوەکانی دیکەی ئەو سەردەمە پێکدێنێ، دژایەتیی هۆکاری تاکەکەسی وهۆکاری کۆمەڵایەتییە. زاراوەی دووهەم دەربڕی ئەو قوتابخانە و بزووتنەوە فیکریانەیە کە رووبەڕووی رەخنەکانی فۆرمالیزم دەبنەوە، بەڵام زاراوەی یەکەم وەکو ئاخێزگەی پێویستی دەروونناسی، زمانناسی یان لێکۆڵینەوە ئەدەبییە فۆرمالیستییەکان ئاراستە دەکرێ. *رێبازی فرۆید (١٩٢٧)*



بابەتی کتێبێکی ڤۆلۆشینۆڤ/ باختین -ە . نووسەر لە دەستپێکدا وێنەیەک لە لقوپۆپە هاوچەرخەکانی دەروونناسی دەکێشێ کە لە ئاکامدا بەسەر دوو رشتەدا دابەشدەکرێن: دەروونناسیی **زەینی** ودەروونناسیی **بابەتیانە**. دەروونشیکاری نوێنەری بەرچاوی دەروونناسیی زەینییە کە (لەم کتێبەدا) بەر هێرش دەکەوێ. رەخنەی *رێبازی فرۆید*، لەسەر ئەم بیرۆکەیە دامەزراوە کە زمان بەموڵکی تایبەتی مرۆڤ دەزانێ و پێ لەسەر خاڵێک دادەگرێ کە یەکەمین حوکمی گرنگی کتێبەکەیە: زمان، سەر لەبەر کۆمەڵایەتییە.

ئەم حوکمە لەخۆڕا ناسەلمێندرێ. لەراستیدا دەکرێ ئەو رەخنەیەش ئاراستە بکرێ کە کردەی بەرهەمهێنانی دەنگ و کردەی وەرگرتن بەتەواوی فیزیۆلۆژیک و تاکەکەسین، کەواتە پێویستیان بە هیچ چەشنە هۆکارێکی کۆمەڵایەتی نییە. ڤۆلۆشینۆڤ/ باختین ئەم رەخنەیە پەسند دەکەن بەڵام خێرا ئەوەش دەڵێن کە ئەم دووکردەیە بەبێ کردەیەکی سێیەم، واتە بەبێ بەرهەمهێنان و وەرگرتنی مانا، هیچ نین و هەر ئەم کردەیەیە کە بنیاتی راستەقینەی زمان سازکات:

> *'مانا'ی واژەو'تێگەیشتن'ی کەس (یان) کەسانی تر لەم مانایە [...] لە سنوورەکانی ئۆرگانیزمی جەستەیی تاک تێدەپەڕن و پێویستیان بە کردەی بەرامبەری چەندین ئۆرگانیزم هەیە: ئەمەش بەجۆرێکە کە ئەم سیستەمە هۆکاری چێکەری دژکردەی گوتەییەو سروشتێکی کۆمەڵناسانەشی هەیە (٣١:٨).*[1]

١- لێرە بەدواوە سەرچاوەی وتە گێردراوەکانی بەرهەمەکانی باختین لە کۆتایی ئەو وتەیەدا دەنووسرێ. ژمارە لای راست لەناو پەرانتزەکەدا پێوەندیی بەژمارەی

*مانا (پێوەندیی) پێویستی بە کۆ هەیە. لە راستیدا هەر گوتارێک بەردەنگێکی هەیە و ئەم بەردەنگەش هەر تەنیا دەورێکی هەڵپەسێردراو ناگێڕێ (بە پێچەوانەی ئەو مانایەی بە هۆی واژەی*
*'وەرگر'ەوە لەزەیندا چەق دەبەستێ): بەردەنگ لە بیچمگیریی مانای گوزارەدا بەشداریدەکات، راست وەکو هۆکارەکانی دیکەی زەمینەی گوزارەسازی کە ئەوانیش هەرهەموو کۆمەڵایەتین.*
*بەشێوەی گشتی ناکرێ هیچ گوزارەیەک تەنیا بخرێتە پاڵ بێژەرەوە: گوزارە بەرهەمی کردەی بەرامبەری بێژەر و بیسەرە و بە مانایەکی بەربڵاوتر، ئاکامی سەرجەم ئەم دۆخە کۆمەڵایەتییە ئاڵۆزەیە کە لەوێ وەدەرکەوتووە.*(۲)

کەواتە پێویست ناکا کە ئەویدی وەکو وەرگر و بەردەنگی خۆمان دابنێین. سەرەکیترین کردەش، واتە وەدەستهێنانی هۆشیاری و خودئاگایی، بەردەوام پێویستی بەوەرگرە، پێویستی بەو سەرنج و نیگایە کە ئەویدی ئاراستەمانی دەکا.

بەرهەم و ئەو ژمارەیەی پاش دوو خاڵەکە هەمان ژمارەی لاپەڕەی بەرهەمی بەرباسە. ناوی لاتینیی کۆی بەرهەمەکانی باختین و ئەنجوومەنەکەی هەر لەم کتێبەدا هاتووە (پێڕستی نووسینەکانی باختین و ئەنجوومەنەکەی بە پێی رێکەوتی بڵاوبوونەوەیان).

۲- سەرنجراکێشە بزانین کە ئەم دوو رستەیە و رستەگەلێکی دیکەی لەم چەشنە کە لە نووسینەکانی باختین لەم ساڵانەدا بەلێشاو وەبەرچاو دەکەون لەگەڵ دەستەواژەیەکی فیلسووفی فەرەنسی، ئیمانۆیل لویناس، بەراورد دەکرێ کە ئەمەیان شێوازێکی زۆر جیاوازی هەیە. لویناس لە ژێر کاریگەرێتی و خوازیاریی ئیگزیستانسیالیستیدایە و لە شوێنێکی تردا ئاماژە بۆ لێکچوونەکانی لەگەڵ ئەندێشەکانی باختیندا دەکرێ.



ناکرێ سەرجەم بەشی گوتەیی لەمرۆڤدا (گوتاری دەرەکی و گوتاری ناوەکی) هەر بەهی تاکەکەسێکی تەنیا بزانرێ. ئەم بەشە نەک هەر هی تاکەکەس نییە، بەڵکو هی تاقمی کۆمەڵایەتی و ژینگەی کۆمەڵایەتی ئەوە. سەرجەم ئەنگێزەکانی کردەوە، هەر چەشنە وەدەستهێنانێکی خودئاگایی و هۆشیاری بەردەوام گوتەییە و پێوەندیی بەدۆزینەوەی کۆیەکی گوتەیی دیاریکراو هەیە و جۆرێ سازکردنی پێوەندیی لەگەڵ نۆرمێکی کۆمەڵایەتییە. بەواتایەکی تر، جۆرێ کۆمەڵایەتییەکردنەوەی خود و کردەوەی خودە. من بۆ وەدەستهێنانی خودئاگایی هەوڵدەدەم بەجۆرێ لە روانگەی کەسانی ترەوە و لە روانگەی نوێنەرێکی تر لە تاقمی کۆمەڵایەتی یان چینەکەی خۆم سەیری خۆم بکەم.

لێرەدا لەوە تێدەگەین کە "کۆمەڵگا" بۆ باختین کاتێ دەستپێدەکات کە دووهەمین مرۆڤ بێتە دی و دەرکەوێ. باختین لێرەدا گەرچی پاڵیداوە بە مارکسیزمەوە و بەڵگەکانی خۆی لەوێ دەهێنێتەوە، بەڵام روانینی وی دەربارەی بەکۆمەڵایەتیکردن تۆزێ نوێخوازانە دەنوێنێ و پێوەندیی "نێوان زەینی" لە باری لۆژیکییەوە دەخاتەڕوو.

بەڵام ئەگەر زمان لە بنەڕەتدا نێوان-زەینی و "کۆمەڵایەتی"یە، لەلایەکی تریشەوە بۆ مرۆڤ ئەم دەرئەنجامە دێتە بەرهەم کە لە بنەڕەتدا بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە ، بوونەوەرێک کە ئەگەر دابەزێندرێتە سەر رەهەندی زیندەوەرناسانەی خۆی، بەناچار لەو تایبەتمەندییانەی کە ئەویان کردووە بەمرۆڤ بێبەش دەمێنێ. دژایەتیکردن لەگەڵ هەر چەشنە دەروونناسییەکی زیندەوەر- ناسانە یان زەینی "تاکگەرا" لە بەرهەمەکانی ویدا هەر لێرەوە سەر هەڵدەدا:

*کەسایەتی زیندەوەرناسانەی دەرهەست، ئەم تاکە زیندەوەرناسانە کە بۆتە هەموو شتێکی ئایدیۆلۆژیای هاوچەرخ، بوونی دەرەکیی نییە. مرۆڤی دەرەوەی کۆمەڵگا و لە ئاکامدا مرۆڤی دەرەوەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی- ئابووریی بابەتیانە، بوونی نییە و ئەم جۆرە مرۆڤە بەرهەمی دەرهەستکارییەکی درۆیینە. کەسایەتی مرۆیی تەنیا لە پێگەی بەشێک لە هاماوی کۆمەڵایەتیدا و لە چین و لەرێگەی چینی خۆیەوەیە کە واقیعی مێژوویی و زایشتی کولتووری وەدەست دێنێ. بۆ چوونە ناو مێژوو لە دایکبوونی سروشتی و جەستەیی بەس نییە، ئاژەڵیش بەم شێوەیە لەدایکدەبێ، بەڵام نایەتە نێو مێژووەوە. لە دایکبوونی دووهەم، واتە لە دایکبوونی کۆمەڵایەتی، پێویستە. مرۆڤ نەک وەک ئۆرگانیزمێکی سروشتی و دەرهەست، بەڵکو وەکو زەویدار،جووتیار، بۆرژوا یان پرۆلتەر لەدایکدەبێ و ئەمەش پرسێکی سەرەکی و بنچینەییە. سەرەڕای ئەمەش، ئەو وەکو رووسی یان فەڕەنسی لەدایکدەبێ و پاشان لە ساتەوەختێکی دیاریکراودا، بۆ نموونە لە ١٨٠٠ یان ١٩٠٠دا، لە دایک دەبێتەوە. تەنیا ئەم دەستنیشان کردنەیە کە پێگەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی مرۆڤ دەکاتە شتێکی راستەقینە و ناوەڕۆکی داهێنانی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی ئەو دابیندەکات. (٢٨-٨:٢٣).*

*ناوەڕۆکی زەین و دەروون، سەر لەبەر ئایدۆلۆژیکییە: لە ئەندێشەی شاراوەو چوارچێوەی نادیارو نائاشکراوە تا سیستەمی فەلسەفی و رێکخراوەیەکی سیاسیی ئاڵۆز، هەموو ساتێ لەگەڵ کۆمەڵەیەکی یەکگرتووی دیاردە ئایدیۆلۆژیکییەکان و، کەواتە کۆمەڵناسانەکاندا رووبەڕووین.(٨:٣٧)*[٣]

---

٣- وردبوونەوە لە سروشتی کۆمەڵایەتی مرۆڤ، لە ناوەوە و دەرەوەی ئەندێشەی مارکسیستیدا پێشینەیەکی دوور و درێژی هەیە. ناوبردنی کۆی ئەم بیر و



---

تێڕوانینانە نامومکین و بێسوودە. لێرەدا تەنیا چەند نموونەیەکی بەرچاو دەخەینەڕوو. هیگڵ لە *پۆلی سەرەتای فەلسەفیدا* (وەرگێڕانی فەرەنسی، ل.١٠٠) دەڵێ: "خودئاگایی بۆ خود واقیعی راستەقینە نییە... تەنیا ئەو رادەیە واقیعییە کە ڤەنوێنی خۆی لە ئاگاییەکانی دیکەدا دەناسێ". لۆدویک فویرباخ لە *بنەواشەکانی فەلسەفەی داهاتوو* دا (١٨٤٣) دەڵێ: "تاک جەوهەری بوونەوەری مرۆیی، نەک لە پێگەی بوونەوەرێکی ئەخلاقی و نەک لە بوونەوەرێکی هزرڤاندا، لە دەروونی خۆیدا نابەستێتەوە. جەوهەری بوونەوەری مرۆیی تەنیا لە ناخی کۆمەڵگا و لەیەکیەتی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدا شاردراوەتەوە.."

لە نێو بیرمەندە هاوچەرخەکانی باختیندا ئاماژە بۆ چەند فەلسەفەکارێکی ئایینی دەکەین. فیلسووفی ئەڵمانی هێرمای کوهن (١٩١٨-١٨٤٢) لە بەرهەمەکەی خۆیدا بەناوی *Religion der Vemuftans den Quellen des Judentums (1912)*،کە بابەخێکی ئەوتۆشی بۆ باختین و هاوڕێکانی نەبووە، دەڵێ: "تەنیا دۆزینەوەی تۆ من دەگەیەنێتە ئاگاداری لە منی خۆم. مارتین بۆبر (فەیلەسووفی ئیسراییلی بەڕەگەز نەمسایی، ١٩٦٥-١٨٧٨، کە باختین بەرهەمەکانی دەناسێ و پێیاندا هەڵدێ) لەساڵی ١٩٣٨دا دەنووسێ: "تاک لەو رووەوە دەگاتە بوونەوەرێتی زیندوو کە لەگەڵ تاکەکانی دیکەدا پێوەندییەکی زیندوو ساز دەکات... بابەتی بناغەیی و بنیاتی بوونی مرۆڤ.

'پێوەندی' مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدایە. لە لایەکی تریشەوە، پێویستە ئاماژە بۆ نزیکیی فیکریی باختین و یەکێ لە دامەزرێنەرانی دەروونناسیی کۆمەڵایەتی لە وڵاتە یەکگرتووەکان بکرێ: جۆرج هێربێرت مید (١٩٣١-١٨٦٢). ڤۆلۆشینۆڤ/ باختین بێگومان نەیان توانیوە تێزەکانی مید بناسن، چونکە ئەو تێزانە لەساڵەکانی سی و پاش مەرگی دانەرەکەیان چاپکران، بەڵام بەچاوێکی باشەوە **دەروونناسیی نوێی هەڵسوکەوت** هەڵدەسەنگێنن. مید بە تەواوی لە باختین دەچێ و لە کتێبی *Mind, Self and Socity – On Social Psychoigy* کە من لە کۆی بەرهەمەکانی، واتە *(١٩٤٤)*،دەگێڕمەوە- دەڵێ: "خودئاگایی پێوەندیی بەتوانای وەبیرهێنانەوەی کۆمەڵێ وەڵامی دیاریکراو لەزەینی ئێمەدا هەیە، وەڵامێک کە هی ئەندامەکانی تری یەک تاقمن)(٢٢٧). سەبارەت بەسروشتی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەنووسێ: "کاتی

ڤلۆشینۆڤ/ باختین رەخنەکانی خۆیان لە ڕێبازی فرۆید بەپێی روانینێکی گشتی دەردەبڕن. بە بیروڕای ئەوان، ئەم ڕێبازە لە ئاکامدا دەروونی مرۆڤ لەسەر بنەڕەتێکی زیندەوەرناسانە دادەمەزرێنێ و خودی ناهۆشیاریش دەخاتە پێش یان دەرەوەی زمانەوە. بەڵام لە راستیدا ئەوەی کە ئێمە دەستمان بگاتە خودی ناهۆشیار جگە لە رێگەی زمانەوە سەر ناگرێ و، هیچ هۆکارێک ئەو مۆڵەتەمان ناداتێ کە لەوێ بەستێنێکی سپی و بەدوور لە هەر چەشنە نیشانەیەکی گوتەیی ببینین:

ئەزموونەکانی خودی ناهۆشیار کە لەرەوتی دانیشتنەکانی دەروونشیکاریدا بەیارمەتی رێبازی **وەبیر هێنانەوەی ئازاد** ئاشکرا دەکرێنەوەو دەردەکەون، وەکو سەرجەم ئەزموونە ئاساییەکانیتری هۆشیاری و ئاگایی، لە راستیدا هەندێ کاردانەوەی گوتەیی نەخۆشەکانن. لایەنی جیاکەرەوەی ئەوان نەک لە چەشنی بوونەوەرێتییەکەیاندا، بەڵکو تەنیا لە ناوەڕۆکەکەیاندا شاردراوەتەوە، واتە جیاوازییەکی ئایدیۆلۆژیکە. لەم رووەوە، دەکرێ خودی ناهۆشیاری فرۆیدی، بەپێچەوانەی ئاگایی ئاسایی و "رەسمی"، وەکو "ئاگایی نارەسمی" پێناسە بکرێ (١٢٨-٨:١٢٧).

---

گەڕانەوە بۆ سروشتی مرۆیی، دەگەڕێینەوە بۆ شتێکی لە بنەڕەتدا تەواو کۆمەڵایەتی.. وێنای خودێک کە لە دەرەوەی ئەزموونی کۆمەڵایەتییدا بیچمی گرتووە، نامومکینە" (هەمان، ل.٢٠٤). "دەبێ ئەندامی تاقم و کۆیەک بی تاکو ببیتە خود" (ل.٢٢٦). "ئاخێزگە و بنیاتەکانی خود، وەکو ئاخیزگە و بنیاتەکانی ئەندێشە، کۆمەڵایەتین"(ل.٢٢٨). لە کۆتاییدا دەچینە سەر قسە کورتەکەی کلۆد لیڤی شترۆس: "قسەکردن لە مرۆڤ وەکو قسەکردن لە زمانە و، قسەکردن لە زمان، لە پێگەی قسەکردن لە کۆمەڵگادایە"(*Tristees Tropiues*, Paris, 1965, p. 351).



*فرۆید و قوتابییەکانی لە شیکارییەکانی خۆیاندا بەردەوام خوازیاری بەرجەستەکردنەوەی ئەنگێزە تاکەکەسییەکانن (وەک سەرکەشی لەبەردەم باوک، کشانەوە بەرەو لای دایک و لەم چەشنە). بەڵام ئاخۆ وتەکانی نەخۆش لە دانیشتنی دەروونشیکارانەشدا سەر بەکردەی بەرامبەر نین کە لەم کۆمەڵگا بچووکە کە پێکهێنراوە لە پزیشک و نەخۆش ئەنجامدەدرێ (بە سەرنجدان بەدەوری بەردەنگ کە ئێستاکە بۆتان ئاشنایە)؟*
*لەم گوزارە گوتەییانەدا، نەک بگۆڕیی دەروونی تاکەکەس، بەڵکو بگۆڕیی کۆمەڵایەتی و پێوەندییە دوولایەنەکانی پزیشک و نەخۆش دەردەکەوێ (٨:١١٩).*

ڤۆلۆشینۆڤ/ باختین تەنانەت ئەوەیان بەلاوە پەسندە کە بڵێین پێوەندیی پزیشک و نەخۆش نییە کە، بۆ نموونە، لە گواستنەوەی پێوەندیی ئودیپی لەگەڵ باوکدا هاتۆتە بەرهەم، بەڵکو خاڵی بەرامبەرو دژی ئەم بابەتە روودەدا: لێکدانەوە و راڤەی بیرەوەرییەکان لە رێگەی تێپەڕاندنی بنەمای بارودۆخی هەنووکەوە بۆ ئەوان سەردەگرێ:

*ئاخۆ ئەم وتەیە راستتر نییە کە بڵێین پزیشک و نەخۆش، بەتەقەلای هاوکاتی خۆیان، کاری ناکەن جگە لە تێپەڕاندنی پێوەندییە هەنووکەییەکانی خۆیان بۆ کۆمەڵی ناهۆشیاری (دایکی یان باوکی)، پێوەندییەک کە لە ناخی رەوتی تیمارکاریدایە؟ (هەڵبەت بەواتایەکی وردتر، هەندێ لەلایەنەکانی ئەم پێوەندییانە یا خود گەڵاڵەی سەرەکییان بەم شێوەیە، چونکە ئەم پێوەندییانە زۆر ئاڵۆزن) (٦:٢٠٤).*

کەواتە، بۆچوونی گشتگیری ڤۆلۆشینۆڤ/ باختین لەسەر رەتکردنەوەی ئەم بابەتانە دانەمەزراوە کە فرۆید بینیویەتی، بەڵکو بەندە بە راڤە کردنەوەیان لە چوارچێوەی ئەو ئەندێشەیەی کە مرۆڤ ئاژەڵێکی قسەکەرەو، کەواتە، کۆمەڵایەتییە:

*دەسەڵاتی فرۆید زۆرتر لە ئاراستەکردنی ئەم پرسیارانە و کۆکردنەوەی کەلوپەل بۆ لێکدانەوەی ئەم پرسیارانەدایەو کەم و کورتییەکەش لە تێنەگەیشتن لە جەوهەری کۆمەڵناسانەی سەرجەم ئەم دیاردانەیە.هەروەهاش، هەوڵیداوە ئەم پرسانە لە ئاقارە سنووردارەکانی دەروون و ئۆرگانیزمی تاکەکەسی جێبکاتەوە و بەڕاستی بیانتری‌نجێنێ. فرۆید رەوتە لە بنەڕەتدا کۆمەڵایەتییەکان لە روانگەی دەروونناسیی تاکەکەسیەوە لێکدەداتەوە (٨:٣٨).*

*شاراوەترین ئەندێشەیەک کە روون نەکراوەتەوە، واتە وەک شەرحێکی فەلسەفیی ئاڵۆز، پێویستی بە پێوەندییەکی رێکخراو لە نێو تاکەکاندایە (هەڵبەت، لە رێکخستنی ئەم پێوەندییانەدا هەندێ شێوەو پێگەی جیاواز لە ئارادایە)، بەڵام فرۆید سەرومڕی زنجیرەی ئایدیۆلۆژیکی، هەر لە یەکەمین تاکو دواهەمین ئاڵقەکەی، لەساکارترین توخمەکانی دەروونی تاکەکەس دەقۆزێتەوە، دەڵێی مرۆڤ لە کەش و هەوایەکدا ژیان بەسەر دەبات کە لە باری کۆمەڵایەتییەوە بەتاڵە (٨:٣٨).*

ئایا جیاوازیی ئاگایی لەگەڵ ناهۆشیاریدا هەمان جیاوازیی دوو شێوەی گوتار نییە؟ ئاخۆ جیاوازیی خود و بەرزەخود، هەمان جیاوازیی نێرەرو وەرگرێکی خەیاڵکرد نییە کە لە زەینی نێرەردایە؟



*ئەو بەشانەی ئایدیۆلۆژیای رۆژانە (Zhitejskajal) [ ئەو چەمکەی ڤۆلۆشینۆڤ/ باختین لە بەرامبەر "ئایدیۆلۆژیای رەسمی" و ئاشکرا بەکاریان هێناوەو لەگەڵ هەمان ئاگایی بەرباسی فرۆیددا یەکانگیرە کە ئاگایی سانسۆرکراو و رەسمییە] دەربڕی لایەنە زاڵ و بەردەوامەکانی ئاگایی چینایەتین... لە پاژەکانی ئایدیۆلۆژیای رۆژانەدا گوتاری لاوەکی بە ساناهی رواڵەتێکی رێکوپێک دەگرێتە خۆ و بەسەربەستی تەواوەوە دەگۆڕدرێ و دەبێتە گوتاری دەرەکی... هەندێ پاژی دیکە لەگەڵ ناهۆشیاریی فرۆیدیدا یەکانگیرن و، لە سیستەمی فەرمانی ئایدیۆلۆژیای زاڵ زۆر دوورن... هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی ئاشکرایی و قووڵیی دابڕانی نێوان ئاگایی رەسمی و نارەسمی، تێپەڕبوونی ئەنگێزەکانی گوتاری ناوەکی بۆ گوتاری دەرەکی دژوارتر دەبێتەوە (١٣٤-١٣٣:٨).*

باختین لە نووسینەکانی دواییدا بە راشکاوی ناپەرژێتەوە سەر ئەم پرسانە، بەڵام بە شێوەیەکی سەرپێیی و خێرا ئاماژە بۆ ئاشنایی خۆی لەگەڵ چەمکە فرۆیدییەکان دەکات و ئەوەش دەستنیشان دەکات کە گۆڕانکاری بەسەر هەڵسەنگاندن و نرخاندنەکەیدا نەهاتووە. باختین بەردەوام زمان لە باری لۆژیکییەوە دەخاتە پێش **خودی‌ناهۆشیار**ەوە:

*هەوڵ بۆ تێگەیینی کردەی دوولایەنە و بەرامبەری گوتارێکی تر لە رێگەی دەروونشیکاری و ناهۆشیاریی کۆییەوە- ئەوەی دەروونناسان (بەتایبەت دەروونشیکاران) ئاشکرایان کردۆتەوە-لە سەدەی رابردوودا هەبووە و، پێویستە بڵێین لە بیرگەی زمانەکاندا بەردەوام چەشنەکان و رێبازەکان*

*پارێزراون، نەک لە ناهۆشیاریی تەنانەت کۆییشدا. هەر لەم بیرگەیەشەوەیە کە چوونەتە نێو گوتار و خەونی (گێڕدراوە و هۆشیارانە بە بیر هێنراوی) تاکەکانەوە... (٣٤٩:٣٨).*

لـە راسـتیدا روانینـی کۆمـەڵناسـانەی تایبـەتـی بـاختین لـە داستایۆڤسکییەوە وەرگیراوە، نەک لە فرۆیدەوە، بیروڕای وی لە نێوان ئەم دوو چەشنەدا جۆرێک سازشت لە ئارادایە. لە رستەیەکدا بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئاماژەی بۆ ئەم دژایەتییە کردووە:

ئاگایی زۆر ترسناکتر لە سەرجەم گرێکانی ناهۆشیارییە (٢٣:٣١).

بە باوەڕی باختین، "لە ناخی مرۆڤدا" بەراستی نەک خود (واتە، کۆی ئەنگێزە ناهۆشیارەکان) بەڵکو ئەویدی لە گۆڕێدایە.

دوو ساڵ پاش رێبازی *فرۆید* کتێبی *مارکسیزم و فەلسەفەی زمان* بڵاودەکرێتەوە. ئەم کتێبەش بەناوی ڤۆلۆشینۆڤەوە چاپ دەکرێ و "نیـوەی" بـۆ رەخنـەکـاریی دوو لایـەنـەی زمانناسـیی هاوچـەرخ تەرخانکراوە. لەم بەرهەمەشدا ئاڕاستە جیاوازەکان لە ناوەوەی ئەو زانستەدا دابەشکراونەتە سەر دوو دەستە، بەڵام لێرەدا هـەردووک مـەحکووم کراون. لەلایەکەوە، زمانناسیی کلاسیک کە لێرە ناوی "بابەتخوازیی دەرهەست"ی لەخۆ گرتووە و لە رێزمانە گشتییەکانەوە تـاکو ئـەوەی سوسـوور و بـاڵی –یـش دەگرێتـەوە: ئـەم زمانناسـییە نایەوێ جگە لە شێوەی دەرهەستی زمان شتێکی تر بناسێ و بە بیانووی ئەوەی کە گوتە، تاکەکەسی و کەواتە هەڵگری گۆڕانکارییە، نایخەنە نێو بابەتی لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەکانی خۆیانەوە. لەلایەکی



تـرەوە، زمانناسـیی رۆمانتیـک "زەینخـوازیی تاکـەکـەسـگەرا"، لـە هـومبرتەوە تـا هوسـرێل و شـپیتزێر، کە تـەنیا بایـەخ و گرنگایـەتی دەداتە گۆڕانکارییە تاکەکەسییەکان و، لە رەچاوکردنی هۆکاری پێش گریمانـەی "زمـان" خـۆی دوور دەخاتـەوە. ئـەم دوو ئامۆژگارییـە لـە رواڵـەت لێکدژانـەدا، لـە راسـتیدا لـەسـەر ئـەم پێشگریمانە سـەرەکییـەدا دامـەزراون کـە گـوزارە تاکـەکـەسـییە. بـەڵام ئێمـە دەزانـین کـە ڤۆلۆشـینۆڤ/ باختین راست پێچەوانـەی ئـەم بیـر و رایـەیان بـەلاوە مەبەست و پەسەندە:

*کارای قسەکەر بەم چەشنە لە ناوەوەڕا رەچاوکراوەو بەتەواوی وەکو بەرهەمی پێوەندییە دوولایەنە کۆمەڵایەتییەکان دەردەکەوێ. نەک هەر دەربڕینی دەرەکی بەڵکو دەربڕینی ناوەکیش پێوەندیی بە بەستێنی کۆمەڵایەتییەوە هەیە. لە ئەنجامدا، ئەو بابەتەی کە ئەزموونی ناوەکی و 'هۆکاری دەرنەبڕدراو' لە لایەکەوە و بابەتمەندییە دەرەکییەکەی لە لایەکی ترەوە پێکەوە گرێدەدا بەتەواوی لە بەستنی کۆمەڵایەتیدا جێگر دەبێ(١٢:١٠٧).*

کـەواتـە، هـەردوو قوتابخانـە زمانناسـانەکە، کـە توانـای تێگـەیینی واقیعی گوتەییان نییە بەم شێوەیەی خوارەوە بەرەوبڕ دەکرێنەوە:

*گوزارەی تاک (گوتە) سەرەڕای ئامۆژیاریی بابەتمەندیی دەرهەست، بەهیچ شێوەیەک نە دیاردەیەکی تاکەکەسییە و نەک لە پێگەی دیاردەیەکی تاکەکەسیدا هەڵگری شیکارییەکی کۆمەڵناسانەیە... بەڵام هەڵەی زەینخوازیی دەرهەست لەوەدایە کە لە سروشتی کۆمەڵایەتی گوزارە تێناگات و*

*پشتگوێی خستووه و، هەوڵدەدا تاکو گوزاره، وەکو دەربڕینی جیهانی ناوەکیی بێژەر، هەر لەم جیهانە بقوزێتەوە... بنەمای گوزاره هەروەک بنەمای ئەزموونی دەربڕاو، بنەمایەکی کۆمەڵایەتییە (١١٤-١١١:١٤).*

لە ئاکامدا لە بەستێنی هەڵسەنگاندنە ئەدەبییەکانیشدا رووبەڕووی ئەم چەشنە واتا و رەخنانە دەبینەوە. کتێبی *رێبازی شێوەیی لە لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکاندا (١٩٢٨)*، کە بەناوی مێدڤێدۆڤەوە چاپکراوە و بە جۆرێ شیکاریی مشتومڕداری فۆرمالیزم دادەنرێ، ناوە لاوەکییەکەی ئەمەیە: *پێشەکییەکی رەخنەگرانە لەسەر بوتیقای کۆمەڵناسانە*. باختین لە پێشەکیی یەکەمین کتێبیدا کە لە ساڵی ١٩٢٩دا و بەناوی خۆیەوە لە ژێر ناونیشانی *پرسەکانی بەرهەمەکانی داستایۆڤسکی*، بڵاوبۆتەوە، دەڵێ: " لە ناخی ئەم شیکارییەی ئێستادا ئەو بڕوایە شاردراوەتەوە کە هەر بەرهەمێکی ئەدەبی کۆمەڵناسانەیە، ئەویش بەشێوەیەکی ناوەکی و جەوهەری." (٣:١٣)

کاتێ باختین پاش ساڵێک **شێوازناسی** دەخاتە بەرباس و لێکۆڵینەوە، هەر ئەم بنەواشە رەخنەگرانەیە وەکو یاسایەک رەچاو دەکات (گومانێک لە ئارادا نییە کە ئەم شێوازناسییە لەگەڵ بنەواشە پێشنیارکراوەکانی فوسیلێردا پێوەندیی هەیە):

*شێوازناسی... ناتوانێ لەوپەڕی گۆڕانکاریی تاکەکەسی و بزاڤە ئەدەبییەکانەوە، تەوەرە گەورەو نەناسراوەکانی گوتاری ئەدەبی ئاشکرا بکاتەوە و دەریان خات. زۆربەی کات شێوازناسی تەنیا بایەخ دەداتە هونەری خۆماڵی و لە ژیانی کۆمەڵایەتی گوتار لە دەرەوەی ژووری هونەرمەند، لە ئاقاری گەورە و بەربڵاوی شوێنە گشتییەکان، شەقامەکان،*



*شار و گوندەکان، تاقمە کۆمەڵایەتییەکان، نەوەکان و سەردەمەکان ئاگادار نییە و پشت گوێیان دەخات(٧٣:٢١).*

ئەم بابەتە پێوەندیدارە بە سەرەتیی هۆکاری کۆمەڵایەتی بەسەر هۆکاری تاکەکەسیەوە هەرگیز بۆ راڤەکردنی ئەو کاریگەرێتییە تایبەت و تاکەی کە رەنگە لەسەر بەرهەمێکی ئەدەبی (یان کەسێک) دایبنێ هەوڵنادات. ئەو کتێبانەی کە باختین بۆ هەندێ نووسەری تایبەت (وەک رابلێ و داستایۆڤسکی) تەرخانی کردوون، لە راستیدا پرسە پێوەندیدارەکان بە چەشنەکان و سەردەقەکان و یان تیۆرییەکی گشتی ئاراستە دەکەن نەک ئەو بابەتانەی پێوەندییان بە تاکەکانەوە هەیە. باختین لە هەموو ژیانی خۆیدا لەم بیروڕا و هەڵبژاردنەی خۆی هەر پاشگەز نەبۆتەوە و بڕوای تەواوی پێی هەبووە.

### ٢. شێوە و ناوەڕۆک:

دووهەمین دووفاقێتی کە لە نووسینەکانی باختیندا، بەتایبەت لەساڵەکانی بیست و تەنانەت تا کۆتایی ژیانیدا، بەردەوام وەبەرچاو دەکەوێ، دووفاقێتی شێوە و ناوەڕۆکە. بەڵام لێرەدا بە پێچەوانەی بەرامبەرێتی دوو هۆکاری تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی، یەکێ لە لایەنەکان بەباشتر لە قەڵەم نادات تاکو ئەوی دی بە سانایی مەحکووم بکرێ، بەڵکو پێ لەسەر پێویستیی پێوەندیی نێوان شێوە و ناوەڕۆک و سەرنجدانی هاوکات بەهەردووکیان و سازدانی هاوسەنگیی تەواو لە نێوانیاندا دادەگرێ. باختین لە پێشەکی *پرسەکانی بەرهەمەکانی داستایۆڤسکی (١٩٢٩)* دا ئەو خاڵە دەستنیشان دەکات کە مەبەستی تێپەڕینە لە **ئایدیۆلۆژیاپەرستی**

دۆگماتیک و فۆرمالیزمی دۆگماتیک و لەسەرەتای وتاری دووردرێژی "گوتار لە رۆماندا" تاڕادەیەک هەر ئەم رستەیە دووبارە دەکاتەوە:

*ئەندێشەی بەڕێوەبەری ئەم کارە، پێشکەوتنی دابڕانی فۆرمالیزمی دەرهەست و ئایدیۆلۆژیاپەرستیی دەرهەست لە لێکۆڵینەوەی گوتاری ئەدەبییە (٧٢:٢١).*

ئەم هاوگوزارەییە لە نووسینە دواییەکانیشدا دەپارێزرێ. بۆ نموونە، لەکاتی ئاراستەکردنی وتەزای "گەلاڵەی زەمانمەند"دا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە:

*ئێمە شوێنی زەمانمەند وەکو وتەزایەکی ئەدەبیی پێوەندیدار بەشێوە و ناوەڕۆکەوە لەقەڵەمدەدەین. (٢٣:٢٣٥)*

لە هەڵسەنگاندنی دەوری داستایۆڤسکی لە مێژووی رۆماندا، دەڵێ:

*ئەم دەرئەنجامانە تایبەتمەندییەکی شێوەیی و ناوەڕۆکییان هەیە. لە بەرهەمەکانی داستایۆڤسکیدا ناوەڕۆکی شێوەیی ئەم ئاکامانە،*

*قووڵتر و بەربڵاوتر و گشتگیرتر لە ناوەڕۆکە ئایدیۆلۆژیکی و دیاریکراو و نەگۆڕەکەیان (٣١:٣٠٩).*

پێگەی رەخنەگرانەی باختین لەم بەستێنەدا نە دژی شێوەیە و نەک دژی ناوەڕۆک (بەپێچەوانەی بەشی پێشووی ئەم وتارە کە لە چاو هۆکاری تاکەکەسی زۆرتر و تارادەیەک بەتەواوی لە هۆکاری کۆمەڵایەتی لایەنگری وبەرگریدەکات). لێرەدا ئەو دژی ئەو کەسانەشە



کە هەڵسەنگاندنی یەکێکیان لەوی دیکە جیادەکەنەوە: "ئایدیۆلۆژیاپەرستان"ی رەسەن و فۆرمالیستە رەسەنەکان. باوترین هەڵەی تاقمی یەکەم ئەوەیە کە توخمێکی بەرهەمەکە، بۆ نموونە، بیرۆکە یان کەسایەتییەکی لێ دەقۆزنەوە و بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەگەڵ هاوواتاکەی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەراوردی دەکەن، بەبێ ئەوەی سەرنج بدەنە پێوەندییەکانی ئەم توخمە لەگەڵ توخمە کاریگەرەکانی دیکە، ئەمەش ئەو پێوەندییانەیە کە لە راستیدا تەنیا دابینکەری مانای بەرهەمەکەن:

*ئەو ئەنجامگیرییە راستەوخۆیانەی کە بە پێی نواندنەوەی لاوەکیی ئایدیۆلۆژیایەک لە ئەدەبدا سەریان گرتووە و بۆ واقیعی کۆمەڵایەتی سەردەمێک تێپەڕێندراون، بۆ مارکسیستەکان پەسەندکراو نین. ئەو کۆمەڵناسە ناڕاستەقینانە وەها کارێکیان کردووە و دەشیکەن و بەردەوام لە پێناو تێپەڕاندنی راستەوخۆی توخمە بنەماییەکانی بەرهەمی ئەدەبی - بۆ نموونە، کەسایەتی یان گەلاڵە و پیلان- بۆ ژیانی واقیعی ئامادەن. بەبیروڕای کۆمەڵناسێکی راستەقینە، پاڵەوانی رۆمان و رووداوی گەلاڵە و پیلان راست بەو بۆنەوە پڕماناتر و ئاشکراکارەوتترن کە توخمگەلی بنەمای هونەرین، واتە ئەگەڕێنەوە بۆ زمانی هونەریی تایبەتی خۆیان و هیچ چەشنە پێوەندییەکیان بە تێپەڕاندنە راستەوخۆ و بێبایەخەکانەوە بۆ ژیانی واقیعی نییە(٣٢-٣٣-١٥).*

هەر بەهەمان شێوە کە کەسایەتی، جگە لە پێوەندی لەگەڵ بەرهەمدا ناناسێندرێ، بەرهەمیش دەبێ لە یەکەم هەنگاودا، لەگەڵ

کۆمەڵەی ئەدەبدا بە پێوەندیدار بزاندرێ. بەڵام ئەدەب لەگەڵ جیهانی واقیعە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا پێوەندیی راستەوخۆی نییە: ئەم پێوەندییە بەهۆی نێوەنجێتی ئایدیۆلۆژیاوەیە... نابێ ئەم گەڕانەوە یەک لە دوایەکانە پشتگوێ بخرێ. وەها ویستێک بەهەمان شێوە تا رادەیەک لە نووسینێکی تینیانۆڤ بەناوی "دەربارەی کاملبوونی ئەدەب" دەدۆزرێتەوە (ئەم نووسینە لە هەمان سەردەمدا (١٩٢٧) بڵاوکراوەتەوە)، ئەگینا دەبینە دیلی کۆمەڵناسیگەریی عامیانە و جەماوەری:

*ناکرێ بەرهەم لە دەرەوەی جەوهەری ئەدەبدا فام بکرێ. بەڵام هاماوی ئەو جەوهەرە و پاژەکانی- وەکو ئەم بەرهەمەی بەرباس- لە دەرەوەی جەوهەری **ژیانی ئایدیۆلۆژیکی** ناتوانرێن فام بکرێن. سەرجەم توخمەکانی ئەم جەوهەرەش ناتوانرێن لە دەرەوەی یاسا گشتییە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکاندا هەڵبسەنگێندرێن و، بخرێنە بەر لێکۆڵینەوە... ناکرێ هیچکام لە ئاڵقە بێکۆتاییەکانی تێگەیینی دیاردەی زنجیرەی ژیانی ئایدیۆلۆژیکی پشتگوێ بخرێ، دیسانەوەش ناکرێ بەبێ تێپەڕبوون لە ئاڵقەی دوایی لە ئاڵقەیەکی تردا بوەستین. بەرهەمی ئەدەبی بەشێوەی راستەوخۆ توخمێکە لە جیهانی تایبەتی ئەدەبی و بەهیچ شێوەیەک پەسەند ناکرێ کە بەشێوەیەکی راستەوخۆ و پاوانخوازانە تەنیا وەکو توخمێک لە ژینگەی ئایدیۆلۆژیکیدا لێی بکۆڵدرێتەوە، وەکو ئەوەی بڵێی ئەم بەرهەمە تەنیا هۆکاری ئەدەبە (٤٢-٤١:٤١)*

سەرەڕای ئەو باسانەی سەرەوە، بەشێکی زۆری رەخنەکانی باختین ئاراستەی لایەنگرانی ناوەڕۆک ناکرێ و، بەڵکو فرەتر رەخنە



لە فۆرمالیستەکان دەگرێ. هۆی ئەم بابەتە زۆر سادەیە: لە ساڵانی پێش هاتنی باختین بۆ بەستێنی ژیانی ئەدەبی، فۆرمالیستەکان بەسەر ئاقارەکەدا زاڵبوون. ئەگەر باختین - لە رێگەی ئاشتکردنەوەی ئەدەب و مێژووی ئەندێشەکانەوە - لە پێگەی "هاوگوزارە"دایە، کەواتە فۆرمالیستەکان "دژە گوزارە"ن، چونکە لەلایەنگرانی جەمسەری "بەر گوزارە"، واتە ئەوانەی ئەدەب بۆ مێژووی ئەندێشەکان دادەبەزێنن، رەخنە دەگرن و هەر بەم بۆنەشەوە ئاشکرایە ئەوان دەبن بە یەکەم ئامانجی رەخنەکانی باختین.

پێوەندیی باختین بە فۆرمالیزمی "رووسی"یەوە ساکار نییە و ئاوێنەیەکە لە هاوڕێیەتی و رووبەرووبوونەوە. سەرەتا دەبێ ئەوە دەستنیشان بکرێ کە باختین لە نووسینە رەخنەگرانەکانی خۆیدا سەبارەت بە فۆرمالیزم لە درێژایی ساڵەکانی بیستدا، بەردەوام وێڕای سەرکۆنە و رەخنەکانی، هەڵسەنگاندنێکی گشتی زۆر باش و ئەرێیانە ئاراستە دەکا: بۆ نموونە، لە وتاری "پرسی ناوەڕۆک: کەرەسە و شێوە لە ئافراندنی ئەدەبیدا" (١٩٢٤) بەم جۆرە دەنووسێ:

لەم قۆناغەی ئێستادا لە رووسیا، لە ئاقاری ناسینی هونەردا کارێکی زۆر جیدی و بەرهەمهێن خەریکە سەر دەگرێ. لەم ساڵانەی دواییدا، ئەدەبی زانستیانەی رووسیا بەهۆی هەندێ کاری بایەخدارەوە دەربارەی تیۆریی هونەر، بەتایبەت لە بەستێنی بوتیقادا، زۆر پێشکەوتووە(٧:٤).

له کتێبی *ڕێبازی شێوەیی له لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا* دەڵێ:

*بەگشتی، فۆرمالیزم دەورێکی سوودبەخشی گێڕاوە و توانیویەتی سەرەکیترین پرسەکانی زانستی ئەدەب بکاتە بەرنامەی کاری خۆی ئەویش بە وەها هێزێکەوە کە ئێستاکە ئیدی پشتگوێ خستن و نکوولی لێکردنی بەهیچ جۆرێ مومکین نییە. هەڵبەت ئەم پرسانە چارەسەر نەکراون، بەڵام تەنانەت هەڵەکان و ئاشکرایی و یەکگرتوویی ئەو بابەتانەش هاندەر بوونە لە پێناو پتر سەرنجدانی ئەو پرسە ئاراستەکراوانەدا (٢٣٢:١٠).*

وەبیر هێنانەوەی نرخاندنێکی دیکەش کە لە ساڵی ١٩٧٠ و لە وڵامی پرسیارێکدا دەربارەی دۆخی هەنووکەیی لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان دەربڕاوە، جێگەی سەرنجە:

*ئێمە هەندێ نەریتی زانستیی مەزنمان هەیە کە هەم لە ڕابردوودا بیچمیان گرتووە (پوتبنیاو ڤوسلۆڤسکی)، هەمیش لەسەردەمی سۆڤیەتدا (تینیانۆڤ توماشۆڤسکی، ئایختباوم، کوکۆڤسکی و دیتران)(٣٢٨:٣٦).*

خاڵی بەرچاو و سەرنجڕاکێش ئەمەیە کە لە نێو سەرجەم لێکۆڵینەوە ئەدەبییە ئەنجامدراوەکان لە یەکێتی سۆڤیەتدا، باختین تەنیا بۆ بەرهەمی سێ فۆرمالیست و یەکێ لە قوتابییەکان ئاماژە دەکات، هەڵبەت گاز لەم سەردەمەشدا بابەتی ڕەخنەکانی باختین گۆڕدرابێتن: فۆرمالیستەکان دەمێکە ئیتر دەورێکی سەرەکی و زاڵ لە مشتومڕە تیۆریک و ئەدەبییەکانی رووسیادا نابینن و کاتی ئەوە هاتووە باختین



نەک لەسەر لایەنە جیاکەرەوەکان بەڵکو سەبارەت بە وێکچوونی خۆی لەگەڵ ئەواندا پێی دابگرێ. سەرەڕای هەموو ئەمانەش، هیچ بەڵگەیەک لە ئارادا نییە کەوا بیربکەینەوە باختین گۆڕانکاریی بەسەر بناغەی هەڵسەنگاندنەکانی خۆیدا هێناوە.

یەکەمین ڕەخنەی باختین لە فۆرمالیستەکان هەر لەو توێژینەوەیەی ساڵی ١٩٢٤یشدا دەبیندرێ. هەڵەی فۆرمالیستەکان ئەوەیە کە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی لە لێکۆڵینەوەی هونەر بەگشتی و لەئاکامدا لە جوانیناسی و، لە دوا شیکاریدا، لە فەلسەفە جیادەکەنەوە. پارێزکردنی پۆزەتیڤیستانەی فۆرمالیستەکان لە لێکۆڵینەوەی بناخە فیکرییەکانی خۆیان، نەبۆتە هۆی ئەوەی کە پێویستیان بە جوانیناسی و فەلسەفەیەکی تایبەت نەبێ، بەڵکو ئەم جوانیناسی و فەلسەفەیە بەشێوەیەکی نائاشکرا دەهێڵنەوە و بەم بۆنەیەشەوەیە کە باختین ئەرکی پۆلێنکاریی ئایدیۆلۆژیای شاراوەی ئەوان لە ئەستۆ دەگرێ و ئەم ئایدیۆلۆژیاشە وەکو چەشنێ "جوانیناسی کەرستەکان" ناو بردە دەکات. بەبیروڕای فۆرمالیستەکان، ئەمە کەرستەکانن (لە ئەدەبدا: زمان) کە شێوە هونەرییەکان بەتەواوی دابین و دەستنیشان دەکەن. باختین لە درێژەی باسەکەیدا دەڵێ کە وەها بۆچوونێک لە ئەنجامدا دەگاتە ئەو خاڵەی کە پێوئستە تەنیا شێوە بەتاڵومردووەکان بپارێزرێن و شێوەش لە ناوەڕۆک جیابکرێتەوە. ئەو لەم بەڵگەهێنانەوەیەیدا وە دووی هەندێ لە ڕەخنەکانی ریگل دەکەوێ کە لەکتێبی *Sitlfragen*دا ئاراستەی هەندێ نووسەری هاوچەرخ، وەکو سیمپر، کراوە (لە لاپەڕە دادێکاندا ئاماژە بۆ گرنگایەتی ئەم نزیکایەتییە دەکرێ).

کتێبەکەی مێدڤێدۆیڤ/ باختین ئەم ڕەخنانە قووڵتر دەکاتەوە. لەلایەکەوە، بابەتە نایەکگرتووەکان و شاراوەییەکان و کەموکوڕییە زۆرەکانی بیرۆکەی فۆرمالیستی ئاشکرا دەکاتەوەو، لە لایەکی تریشەوە،ئاماژە بۆ ئاکامە زیانهێنەرەکانی پاراستنی جیایی و دووریی نێوان شێوە و ناوەڕۆک دەکات. بەبێ چوونە نێو پاژەکانی ئەم مشتومڕە کۆنەوە، دەکرێ بوترێ کە بەڵگاندنەکانی مێدڤێدۆڤ/ باختین گرنگایەتییەکی ڕەهایان هەیە و بەگشتی قایلکەرن.

لە پاڵ ئەمەشدا، بەتەواوی نازانرێ کە ئایا پرسەکە بەم شێوەیە و لەم ڕێگەیەوە چارەسەر کراوە یان نا، چونکە بیرۆکە و ئامۆژگاریی فۆرمالیستی کە ئەنجامی ڕەخنەکانی باختین-ە لەگەڵ چالاکیی راستەقینەی گرووپی فۆرمالیستەکاندا تاڕادەیەک لێکجیاواز و لێکدوورە. لە نێوان گوتە بنەڕەتی و تیۆریکەکانی فۆرمالیستەکان، کە فرەتر دەکەونە بەرباسی باختین-ەوە، لەلایەکەوەو، ئەندێشە زۆرتر پاڵەکییەکانیان لەلایەکی دیکەوە کە دەکرێ لە بەرهەمی راستەقینەی ئەوانەوە دەربکێشرێ، جیاوازییەکی ئاشکرا لە گۆڕێدایە. ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئەم گوتانە شتێ نین جگە لە وەرگێڕانەوەی جوانیناسیی ڕۆمانتیک کە لە زمانناسییەوە کاریگەرێتی وەرگرتووە (بەتایبەتی لە ڕێگەی چەمکی "زمانی شاعیرانە"وە). ئەو ئەندێشانەی لە بەرهەمی فۆرمالیستەکانەوە سەر هەڵدەدەن دەبنە هۆی دۆزینەوەی لایەنگەلێکی زۆری بەرهەمە ئەدەبییەکان کە تاکو ئێستا نەکەوتوونەتە بەر چاوی ڕەخنەگرەکان و هەربۆیە لە ئاکامدا دەگەنە وەلانانی پێناسەی زمانناسانەی ئەدەب. ئەو بابەتانەی کە بەرهەمەکانی باختین لە سالانی دواییدا زیاتر تیشک دەخەنە سەریان بۆ یەکەمجار لەگەڵ بەرهەمی فۆرمالیستەکاندا کەوتوونەتە بەر نیگای تیۆری داڕێژانەوە.



بۆ نموونە، ئایختباوم، بیرۆکەین"دەنگی گێڕانەوەیی"ی ئاراستە کردووە و ئینیانۆڤ پرسی "وتووێژی دەقەکان"ی هێناوەتە کایەوە. پێدەچێ باختین تەنیا لە دوا نووسینی خۆیدا پەی بەم ڕەهەندەی بەرهەمە فۆرمالیستیەکان بردبێ کە بریتییە لە: "مانای پۆزەتیڤی فۆرمالیزم (پرسە نوێکان و لایەنە نوێکانی هونەر)."(٢٣٢:٤٥)

بەڵام باشتر وایە بگەڕێینەوە بۆ ئەندێشەی وی لەسالەکانی سیدا. لە *ڕێبازی شێوەیی لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا*، ڕەخنەکاریی فۆرمالیستە رووسییەکان هاوکاتە لەگەڵ لێکدانەوەی پڕ شۆڕانەی بیرۆکەیەکی دیکە کە باختین ناوی ناوەتە "فۆرمالیزمی ڕۆژئاوایی" (لێرەدا واژەی "فۆرمالیزم" بەراستی ئیدی گونجاو نییە). ئەم زاراوەیە پێوەندیی بە نووسینەکانی تاقمێ تیۆری داڕێژی هونەری (شێوەکاری و پەیکەرسازی)یەوە هەیە کە لە ئەڵمانیا لە دایکبوون و بریتین لە ک. ڤیدلیر، ئـ هیدلدەبراند، ئـ ریگل، و. ڤۆرینگر و ڤۆلفلین. باختین لەیەکەمین کتێبی خۆیدا (١٩٢٤-١٩٢٢) لە هەمبەر ئەماندا پێگەیەکی تارادەیەک ڕەخنەگرانەی هەبووە: ئەوەی ئێستا کە مێدڤێدۆڤ/ باختین لە بەرهەمی "فۆرمالیستگەلی" ڕۆژئاواییدا ستایشی دەکەن، هەمان خۆپاراستنی ئەوانە لە چوونە ناو لێکۆڵینەوەی هەر تەنیا شێوە یان ناوەڕۆک، هاوکات بەربەرەکانێ لەگەڵ پۆزەتیڤیزم (فۆرمالیزم) و ئایدیالیزمیشدا (ئایدیۆلۆژیا پەرستی) دەکەن:

*ئەگەر فۆرمالیزم (ی ڕۆژئاوایی) بیرۆکەی یەکێتی بنەمایی و بەردەوامی بەرهەم لە بنەڕەتدا لە بەرامبەر ئایدیالیزم و بەشێوەیەکی گشتیتر لە هەمبەر هەر چەشنە ئایدیۆلۆژیا پەرستییەکی دەرهەست لە راڤەی هونەردا ئاراستە دەکا، لە بەرامبەر پۆزەتیڤیزمیشدا لێواولێویی واتایی*

*وقووڵایی و وردیی هەرکام لە توخمەکانی بنەمای هونەری بەدڵنیایی و بەتەواوی و بەڕاشکاوییەوە دەستنیشان دەکات(٦٨:١٠).*

*بەم بۆنەوەیە کە ناکرێ ئەم "فۆرمالیزم"-ە بەراستی وەکو فۆرمالیزم بەو مانا باوەی هەیەتی دابندرێ، هیچ شتێک بە ئەندازەی پشتگوێ خستن و ئەتککردنی گرنگایەتی و مانای سەرجەم توخمە پێکهێنەرەکانی بنەمای هونەری- بەبێ یەکودوو- لە ڕەوتە شێوەییەکانی ئەورووپا دوور و نامۆ نییە(٦٨:١٠).*

ئەو چەمکە سەرەکییەی فۆرمالیستە ڕۆژئاواییەکان لە لێکۆڵینەوەی هونەریدا ئاراستەیان کردووە، چەمکی خود و هونەر نییە، بەڵکو چەمکی تەکنیکەکانی بیناکەیە. ئەمەش زاراوەیەکی هیدلدەبراندە (شێوەکاری ئەڵمانی، ١٩٢١-١٨٤٧) کە مێدمێدۆڤ/ باختین گەرەکیان بوو بە پاراستنی دەورەکەیەوە، واژەی بنەما یان بینای بۆ دابنێن (واژەی بینا Konstruckcija هەر لەو سەردەمەشدا بۆ تینیانۆڤ گرنگ بووە): "بەراستی هەمان بنەمای ئەدەبییە کە پێویستە بابەتی بوتیقا بێ." (١٤١:١٠)

بەم بۆنەوە، تێگەیینی گشتیی مێدمێدۆڤ/ باختین لە "فۆرمالیزم"ی ڕۆژئاوایی زۆر پۆزەتیڤە (دوای ئەوەش دەبینین کە باختین چەندین ڕای گرنگی لەم تیۆریانە وەرگرتووە):

*ڕەوتی شێوەیی لە لێکۆڵینەوەکانی هونەر لە ڕۆژئاوا لە هەر بەرنامەیەکی هونەریی دیکە بەربڵاوترە، ئەگەرچی زۆریش لە هەندێ هەڵبژاردەی هونەریی دیکە دوور نییە- هەڵبژاردنە هونەرییەکانی هەر نووسەرێک لەوی تر جیاوازە. ئەم ڕەوتە تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی*



*هونەر دەستنیشان دەکات، ئەو تایبەتمەندییانەی بۆ هەرکام لە هونەرەکان و هەریەک لە ڕەوتە هونەرییەکان دەوری سەرەکی هەیە (٦٨:٦).*

*ئەو پرسانەی کە ئەم ڕەوتە ئاراستەی دەکا و ئەو ئاڕاستە سەرەکییانەی کە بۆ چارەسەرکردنیان هەڵیدەبژێرێ لەڕوانگەی ئێمەوە بەشێوەیەکی گشتی پەسەندکراو ئەنوێنن (٧٦:١٠).*

هەڵبەت ئەمە بەو مانایە نییە کە مێدمێدۆڤ/ باختین لەهەر چەشنە ڕەخنەیەک لە "فۆرمالیستگەلی" ڕۆژئاوایی خۆ دەدزنەوە: ئەوان بەتایبەت ڕەخنە لەم "فۆرمایستگەلە" دەگرن کە بۆچی ڕوانگەیەکی کۆمەڵایەتی-مێژووییان نییە و بەشێوەیەکی تاڕادەیەک دەرهەست ڕەخنە لە "بناغە فەلسەفییەکانی وان دەگرن (٧٦:١٠).

هەر لەم کتێبەی *ڕێبازی شێوەیی لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبیدا*یە کە مێدڤێدۆڤ/ باختین هەوڵدەدەن بەشێوەیەکی گشتی ئەو خاڵە دەستنیشان کەن کە ئەم ڕێگە مامناوەندییە، واتە ئەم شێوە ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ بەرهەمە ئەدەبییەکاندا کە بایەخدانی هاوکات بەشێوە و ناوەڕۆکیان تێدایە، دەتوانێ خاوەن چ ناواخنێک بێ. ئەوان ئەم پرسە بەم چەشنە پۆلینکاری دەکەن:

*پرسی ئاراستەکراو کاتێ چارەسەر دەکرێ کە بتوانرێ لە بەرهەمی ئەدەبیدا وەها توخمگەلێک بدۆزرێتەوە کە بەشێوەیەکی هاوکات ئامادەبوونی مادیی و گوتار واتاکەشی پیشانبدات و نێوەنجی قووڵایی و گشتێتی ماناو یەکبوونی گوزارەکەشی بێ. ئەم نێوەنجە ئەگەری تێپەڕینی بەردەوام لە پەراوێزی بەرهەمەوە بۆ ناخی واتا ناوەکییەکەی،*

*واتە، ئەگەری تێپەڕین لە شێوەی دەرەکییەوە بۆ مانای ناوەکیی ئایدیۆلۆژیکی، دەمێنێتە دی (١٦٢–١٠:١٦١).*

ئەمەش بەرهەمی یەکەمین هەوڵەکانی بۆ چارەسەریی ئەم پرسە:

*لە راستیدا، کام توخمە کە ئامادەبوونی مادیی گوتار گرێدەداتە ماناکەیەوە؟ بەبیروڕای ئێمە ئەم توخمە بریتییە لە بایەخدانی (Ocenka) کۆمەڵایەتی (١٠:١٦٢).*

*ئێمە ئەو واقیعە مێژووییە بە بایەخدانی کۆمەڵایەتی ناوبردە دەکەین کە ئامادەبوونی تایبەتی گوزارە گرێدەداتە گشتێتی و تەواویی ماناکەیەوە و ماناش لە دۆخێکی تاکەکەسی و دیاریکراودا وێنا دەکات‌و، بەئامادەبوونی دەنگداری گوتار، لە ئێرەو لە ئێستا، 'مانا'یەک ساز دەکا (١٠:١٦٨).*

لە نێوان گشتێتی مانای واژەکان- بەو جۆرەی کە لە فەرهەنگەکاندا دەدۆزرێنەوە- لە لایەکەوەو، گشتێتی و یاسا و رێساکانی رێزمان و یەکبوونی ئەو رووداوە دەنگدارەی لەکاتی دەربڕینی گوزارەدا دێتە بەرهەم لە لایەکیترەوە، رەوتێک بیچم دەگرێ کە پێوەندیی ئەم دوو ئاراستەیە چێدەکا، ئەمەش ئەو رەوتەیە کە بەگوزارە سازی دادەنرێ. ئەم رەوتە هەر تەنیا پێویستی بە ئامادەبوونی دوو جەستەی مادی، واتە جەستە نێرەر و وەرگر نییە، بەڵکو دەبێتە هۆی پێویستیی ئامادەبوونی دوو (یان چەند) جەوهەری کۆمەڵایەتی کە دەنگی نێرەر و ئاسۆی وەرگر وەرگێڕدراوی ئەوانەن. شوێن و کاتی روودانی ئەم چەشنە گوزارەسازییەش هەر تەنیا



هەندێ وتەزای سروشتی نین، بەڵکو کاتی مێژوویی و شوێنی کۆمەڵایەتین. پێوەندیی "نێوان-زەینی"ی مرۆیی لە رێگەی هەر گوزارەیەکی تایبەتەوە بەدیدێ:

دەکرێ هەر کام لە توخمەکانی بەرهەمەکە بە رستەیەک لە نێو مرۆڤەکاندا بشوبهێندرێ. بەرهەم لە هاماوی خۆیدا بریتییە لە کۆی ئەم شتانە کە جۆرێ کردەی دوو لایەنەی کۆمەڵایەتی و ئاڵۆز و زۆر جیاواز لە نێو ئەو کەسانەی کە پێوەندییان بە بەرهەمەوە هەیە، بەدیدەهێنێ (١٠:٢٠٥).

لەم کتێبەدا تەنیا قامک خراوەتە سەر ئاراستەکردنی گەڵاڵەیەکی گشتی. بەڵام باختین ساڵێک پاش ئەمە، یەکەمین لێکۆڵینەوەکانی خۆی دەربارەی بەرهەمە تایبەتەکان، دەربارەی داستایۆڤسکی و تۆلستۆی (بەتایبەت "پێشەکی"یەکەی لەسەر رۆمانی *هەستاوە*) بەناوی خۆیەوە بڵاودەکاتەوە. ئەم لێکۆڵینەوانە لە پێگەی چوارچێوەی هەندێ بنەواشەدان کە پێشتر ئاماژەیان بۆ کراوە، چونکە بەیارمەتی دیاریکردنی دەنگەکان و ئاسۆکان و لە ئاکامدا جیهانبینییە دەربڕاوەکانی ئەم بەرهەمانەدایە کە باختین دەستدەکاتە لێکۆڵینەوەیان. نووسینەکانی وی لە ساڵەکانی سی و بەتایبەت ئەوانەی کە بۆ وتەزای "شوێنی زەمانمەند" تەرخانکراون، روانینەکەی وی کامڵتەر دەکەن، ئەو روانینەی کە دەیەوێ نە ناوەڕۆک پشتگوێ بخات و نەک شێوە.

کەواتە، بەتەواوی رەوایە پێگەیەک بدرێتە باختین کە بۆ خۆی خوازیاریەتی; پێگەیەک کە ئەو ئەگەرەی بۆ دەرەخسێنێ تاکو پاش تێزی ئایدیۆلۆژیاپەرست و ئەنتیتێزی فۆرمالیست، سەنتێزەکەی ئەوان ئاراستە بکات. پاشفۆرمالیزمبوونی باختین بەم مانایەیە کە

فۆرمالیزم تێدەپەڕێنێ و دەباتە ئەولاترەوە، هەڵبەت پاش وەرگرتنی فێرکاری و ئامۆژگارییەکانی. بێگومان لە خۆڕا نییە کە هەندێ بەرهەمی رەخنەگرانەی مەزن کە لەوە بەدوا خولقێندران، یان تەنانەت ئەو بەرهەمانەی لە باختین نزیکن، هەر هەموویان لەم هاتوچۆوەو لە رەوتی پێشکەوتنی قوتابخانە فۆرمالیستە پێشووەکانەوە هاتوونەتە دی: بۆ نموونە کتێبی *Mimesis* (*لاساییکاری*) بەرهەمی ئویرباخ کە بیرۆکەی "شێوازناسیی نوێ" (کە بۆ وێنە، نموونە بەرچاوەکەی شپیترێر-ە) لە خزمەت روانینێکی مێژوویی و کۆمەلایەتیدا دادەنێ؛ یان کتێبی *سەرهەڵدانی رۆمان* بەرهەمی یان وات کە لە ماناناسییەکەی ریچاردز تێدەپەرێ تا جۆرێ مێژووی ئەدەبی بسازێنێ کە لە پێوەندیی لەگەڵ مێژووی ئەندێشەکان و مێژووی کۆمەڵگادا بێ. لە راستیدا، بەهیچ شێوەیەک ناکرێ بەبێ رەتکردنەوەی پەتی یاخود نائاگاداربوون لە فۆرمالیزم لەمەش زیاتر بچینە پێشەوە و لێی "تێپەڕین".

## (١)

## گوتار له ژیان و گوتار له شیعردا

## پێشەکییەک لەسەر بوتیقای کۆمەڵناسانە

میخاییل باختین/ ڤ.ن. ڤۆلۆشینۆڤ

ڕێبازی کۆمەڵناسانە لە لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکاندا تارادەیەک تەنیا هەر بۆ شیکاریی پرسە مێژووییەکان بەکارهێنراوە، لەکاتێکدا ئەو پرسانەی ناوی بوتیقای مێژوویییان لێنراوە- واتە کۆی ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بەلایەنە جیاجیاکانی شێوەی هونەری و شێوازەوە هەیە بەیارمەتی وەها ڕێبازێک هەڵنەسەنگێندراون[1].

١. ئەم وتارەی بەردەست لەو وتارانەیە کە لە پاشکۆی کتێبەکەی تۆدۆرۆڤ دەربارەی باختین، لە بەشی "نووسینەکانی ئەنجوومەنی باختین"دا هێنراوەتەوە. تۆدۆرۆڤ یادداشتێکی لەسەر ئەم پاشکۆیە نووسیوە کە لە بەشێکیدا نووسراوە: "ئەم چوار دەقەی کە بۆ یەکەمجار لەم پاشکۆیەدا و لە پاڵ یەک بڵاودەکرێنەوە لە سۆڤیەتدا و لە نێوان ساڵەکانی ١٩٣٠-١٩١٦دا بەناوی ڤ.ن. ڤۆلۆشینۆڤ و. م.م. باختین-ەوە چاپکرابوون... ئەم دەقانە یەکەمین بڵاوکراوەی گرنگی ئەنجوومەنی باختین یان یەکێ لە ئەندامەکانییەتی (بەڵام یەکەمین نووسینەکانی نین)... لە ڕەوتی گۆڕانکاریی باختین‌دا ئەم نووسینانە هی ئەو سەردەمەن کە خوازیاریی وی بەرەو لای کۆمەڵناسیدا بوو و لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بەوەی ئەوڕۆکە "پراگماتیکی" پێ ئەوترێ ئەنجامدەدرا (واتە، لێکۆڵینەوەی گوتار لە هەمبەر لێکۆڵینەوەی زماندا). دەقی یەکەم کە کۆنترین نووسراوەشە، "گوتار لە ژیان و شیعردا" لە ڕاستیدا



بەپێی بڕوایەکی ناڕاستەقینە- کە تاقمێ لە مارکسیستەکانیش لایەنگری لێدەکەن- ڕێبازی کۆمەڵناسانە تەنیا کاتێ بەڕاستی ڕەوایە کە شێوەی داهێنانی هونەری، بەهۆی پڕیی لایەنی باوەڕییەوە - واتە ناوەڕۆک- لە چوارچێوەی واقیعی کۆمەڵایەتی دەرەکیدا و لەباری مێژووییەوە دەست بکاتە پەرەسەندن و بەربڵاوبوونەوە. لە پاڵ ئەمەشدا، شێوە خۆی لەخۆیدا خاوەنی سروشتی تایبەتی خۆیەتی و، بەپێی هەندێ یاسای تایبەتەوە، کە هونەرین نەک کۆمەڵناسانە، دابیندەکرێ.

وەها ڕوانگەیەک بەتەواوی دژی بناغەکانی ڕێبازی مارکسیستی و یەکبینی و مێژوومەندییەکەیەتی. ئاکامی ئەم ڕوانگەیە، دابڕانی شێوە لە ناوەڕۆک و تیۆری لە مێژووە. کەواتە پێویستە دەست بکەین بە لێکدانەوەی ورد و شیکارانەی ئەم ڕوانینە ناڕاستانە: چونکە ئەمانە لە کۆی تیۆرییە هاوچەرخەکانی هونەردا، خاوەن بایەخ و گرنگایەتییەکی بەرچاون.

ڕوونترین و بەڵگەدارترین لێکدانەوەی وەها ڕوانگەیەک بەم دواییانە لەلایەن مامۆستا ساکولین-ەوە ئاراستەکراوە[2]. ئەو لە ئەدەب و مێژووی ئەدەبدا دوو زنجیرە جیادەکاتەوە: زنجیرەی خۆ بنیات (ناوەکی) و زنجیرەی هۆدار. "ناوکەی هونەری"ی خۆبنیات خاوەن هەندێ بنەمای دیاریکەر و تایبەتە کە تەنیا هەر هی خۆیەتی.

بەیاننامەی ڕاستەقینەی ئەم زانستە تازەیەی گوتار و بەیاننامەی "بوتیقای کۆمەڵناسانە"یە کە لەژێر ناوی وتارەکەشدا ئاماژەی بۆ کراوە (بوتیقای گوزارەسازی و دابەشکاریی گوزارە). تێزەکانی ئەم وتارە، تا کاتی مەرگی لە پەنجا ساڵ پاش نووسینی ئەم وتارە، هەر دیار و بەردەوامە.

2. P. N. Sakouline, *La Methode Sociogique eu Etude Litteraires.*

لەلایەکی ترەوە، ئەم پیشەیە هەڵگری گۆڕانکارییەکی سەر بەخۆیەوە و"بەپێی سروشتی خۆیەتی". لە گەڕیانی هەمان ڕەوتی دووهەمدایە کە ئەدەب، کاریگەرێتی "هۆدار"ی ژینگەی کۆمەڵایەتی دەر-هونەری لە خۆ دەگرێ.

بەپێی وەها ڕوانینێک، کۆمەڵناسی هیچ پێوەندییەکی بە "پیشەی خۆبنیات و ناوکەیی"ی ئەدەب و، بنەماو گۆڕانکارییە سەر بەخۆکەیەوە نییە. لەم ئاقارەدا، تەنیا بۆتیقای مێژوویی و تیۆریک - بەرێرەوە تایبەتەکانی خۆیەوە- شیاو و گونجاوە.[٣] لە پاڵ ئەمەشدا، ڕێبازی کۆمەڵناسانە ناتوانێ شیکارییەکی سەرکەوتووانە وەدەستبهێنێ مەگەر ئەوەی کە لە کردار و پەرچەکرداری هۆداری نێوان ئەدەب و ژینگەی کۆمەڵایەتی دەرەوە- هونەری کە ئەدەبی داگیرکردووە بکۆڵێتەوە. سەرەرای ئەمەش، شیکاریی ناوەکی(وناکۆمەڵناسانە)ی جەوهەری ئەدەب و بابەتمەندییە جەوهەری و خۆبنیاتەکەی دەبێ لە پێش شیکاریی کۆمەڵناسانەدا ڕەچاوبکرێ.

کۆمەڵناسیی مارکسیستی بەهیچ شێوەیەک ناتوانێ لەگەڵ وەها حوکمگەلێکدا تەبا و هاورێک بێ. هەڵبەت پێویستە ئەوەش بوترێ کە تائێستا کۆمەڵناسی تارادەیەک تەنیا لە هەندێ پرسی دیاریکراو و

٣. "توخمگەلی شێوەی شیعری (لە واژە، وێنە، کەسێتی، دەستەواژەکان، چەشنو، واتای شاعیرانە و شێوازی هونەر) بەگشتی و لە یەکەم هەنگاودا پێکهاتەی بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی ناوەکین، بەڵام بەیارمەتی ئەو ڕێبازانەی کە لە بوتیقای تیۆریکدا باویان هەیە و لەسەر دەروونناسی، جوانیناسی و زمانناسی دامەزراون. ئەم ڕێبازانە لەلایەن "ڕێبازی شێوەیی"ی ناوبراوەوە دێنە بەکارهێنان."( P.N. Sakoaline.Ibid,p. 27).



سەرهەڵداو لە مێژووی ئەدەب کۆڵیوەتەوە و هەرگیز گەرەکی نەبووە بنەمای "ناوەکی"ی بەرهەمە هونەرییەکان بە ڕێبازە تایبەتەکانی خۆی بەشێوەیەکی شێلگیرانە بپشکنێ. لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی ئەم بنەمایە لە خۆرا سنووردار کراوەتەوە بۆ ئاقاری شیاوی ڕێبازە جوانیناسانە و دەروونناسەکان و هەندێ ڕێبازی دیکە کە هیچ لێکچوونێکیان لەگەڵ ئەدەبدا نییە. بۆ سەلماندنی ئەم بابەتە هەر ئەوە بەسە کە بەشێوەیەکی گشتی سووکە ئاورێک لەهەریەک لە بەرهەمە هاوچەرخەکان دەربارەی بوتیقا یان تیۆریی هونەری بدەینەوە. لەواندا بچووکترین نیشانەیەک لە کاربردی وتەزا کۆمەڵناسانەکان نادۆزینەوە. لەواندا بابەتی هونەر بە شێوەیەک ئاراستەکراوە کە دەڵێی هونەر، بەهۆی سروشتی خۆیەوە، بە هەمان ئەندازەی بینای فیزیکی یان کیمیایی چشتەکان، زۆر لە هۆکاری کۆمەڵناسانە دوورە. زۆربەی تیۆری دارێژانی هونەر، لە ئەورووپای رۆژئاوا و رووسیا، هەر ئەم بیرورایەیان دەربارەی ئەدەب و هونەر هەیە. کەواتە، لە تیۆریی هونەر وەکو زانستێکی تایبەت و دوور لە هەر چەشنە دەستێوەردانێکی کۆمەڵناسانە سەرسەختانە پشتیوانی دەکەن[٤].

٤. "ئەگەر ئەدەب وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دابنێین، لە ئاکامدا ناچارین پرسیارێک دەربارەی دیاریکردنی "هۆدارێتی"ی ئەدەب ئاراستە بکەین. بەبیرورای ئێمە، ئەمە دیاریکردنێکی کۆمەڵناسانەیە. ئێستاکە (دوای تێپەڕین لە قۆناغی شیکاریی ناوەکی) مێژوونووسی ئەدەب لە ئاکامدا هەقی ئەوەی هەیە لە پێگەی کۆمەڵناسێکدا خۆی بنوێنێ و "بۆچی"یەکانی خۆی بەم مەبەستەوە ئاراستە بکات کە دیاردە ئەدەبییەکان لە ڕەوتی گشتی ژیانی کۆمەڵایەتی لە سەردەمێکی دیاریکراودا بترنجێنێ و، پاشان لە قۆناخی دووهەمدا پێگەکانی ئەمانە لە کۆی وەها مێژوویەکدا دیاری بکا هەر لێرەشدایە کە ڕێبازی کۆمەڵناسانە کاریگەرترە،

له پاساوهێنانەوەشدا بۆ ئەم ڕوانگەیە تارادەیەک بەم شێوەیەی خوارەوە بەڵگە دەهێنینەوە: هەر شتێ کە بۆ شمەک دەگۆڕدرێ و دەبێتە بابەتی دانوستان، بایەخ و هاتووچۆی لە ناخی کۆمەڵگای مرۆییدا، سەر بەبابەتمەندیی کۆمەڵایەتی و ئابوورییە. گریمان کە وەها بابەتمەندییەک بەباشی و بەتەواوی بناسین، بەڵام ئەم بابەتە نابێتە ڕێگر لە بەردەم ئەوەی کە هیچ زانیارییەکمان سەبارەت بەبینای فیزیکی و کیمیایی ئەو شتەی کە بۆتە شمەک نەبێ. لەلایەکی دیکەشەوە، لێکدانەوەی شمەک سەرەتا پێویستی بە شیکارییەکی فیزیکی و کیمیایی هەیە. وەها شیکارییەکیش هەر تەنیا لەسەردەستی کیمیازان و فیزیازانگەلێک سەر دەگرێ کە لەبەر تیشکی ڕێبازە تایبەتەکانی خۆیاندا، تەنیا کەسی جێ متمانە و پسپۆڕ لەم بەستێنە تایبەتەدان. بەبیروڕای ئەم تیۆری داڕێژانە، دۆخی هونەریش هەر بەم شێوەیەیە: هونەر کاتێ دەبێ بەهۆکاری کۆمەڵایەتی و، لە هۆکارە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەش کاریگەرێتی وەردەگرێ، بێگومان دەکەوێتە ژێر بابەتمەندیی کۆمەڵناسانەوە، بەبێ ئەوەی کە ئەم بابەتمەندییە کۆمەڵناسانەشە هیچ کات ئەگەری دۆزینەوەی جەوهەری جوانیناسانە بدا بە دەستەوە، هەر بەهەمان شێوە کە ناکرێ فرمووڵی هیچ شمەکێک بەپێی بناغەی ئابووریی گەڕیانی شمەک دەستنیشان بکرێ، تیۆریی هونەر و بوتیقاش دەبێ بۆ بەرهەمی هونەری بە دوای وەها

ڕێبازێک کە ئەگەر سەبارەت بە مێژووی ئەدەب بەکارببرێ، دەتوانێ ببێتە ڕێبازێکی مێژوویی- کۆمەڵناسانە. لە قۆناخی یەکەمی هەڵسەنگاندنەکەی ئەودا، واتە، شیکاریی ناوەکی، بەرهەمی ئەدەبی لە پێگەی بەهایەکی هونەری دادەبرێ کە مانا کۆمەڵایەتی و مێژووییەکەشی لە بەرچاوە." (P.N. Sarolini, Obia.pp.27-8)



فرمووڵێکدا بگەڕێن: فرمووڵێکی تایبەت و سەربەخۆ جیا لە کۆمەڵناسی.

هەروەها کە پێشتر وترا، وەها ڕوانگەیەک بۆ جەوهەری هونەر، لە بنەوەڕا دژایەتی لەگەڵ بنەواشە مارکسیستییەکاندا هەیە. هەڵبەت هەرگیز ناکرێ فرمووڵی کیمیایی لە ڕێگەی ڕێبازی کۆمەڵناسانەوە بدۆزرێتەوە، بەڵام بەهەر حاڵ، هەر تەنیا لە سۆنگەی وەها ڕێبازێکەوەیە کە دەتوانرێ "فرمووڵ"ێکی زانستیی بایەخدار بۆ هەر کام لە ئاقارەکانی ئایدیۆلۆژیا دەستنیشانبکرێ. سەرجەم ڕێبازەکانی دیکە، بەتایبەت ڕێبازە "ناوەکی"یەکان تووشیاری زەینخوازی دەبن. ئەوان هێشتا نەگەیشتوونەتە دەربازبوون لە شەڕی بێئاکامی بیروڕا و ڕوانگەکان و، بەهیچ شێوەیەک ناتوانن شتێک ئاراستە بکەن کە تەنانەت وێکچوونییەکی دووریشی لەگەڵ وردبینی و ئاشکرایی فرمووڵی کیمیاییدا هەبێ. هەڵبەت ڕێبازی مارکسیستیش ناتوانێ خاوەن وەها بانگەشەیەک بێ: زانستی ئایدیۆلۆژیا، بەسەرنجدان بە جەوهەری بابەتی لێکۆڵینەوەکەیەوە، ناتوانێ هەڵگری وردبینی و ئاشکرایی زانستە سروشتییەکان بێ. بەڵام ڕێبازی کۆمەڵناسانەی مارکسیستی لەمەدا توانایە و بۆ یەکەمین جار، دەبێتە ئەگەری پتر نزیکبوونەوە لە لێکدانەوەی زانستییە ئافرێندراوە ئایدیۆلۆژیکەکان. چشتە فیزیکی و کیمیاییەکان لەدەرەوەی کۆمەڵگای مرۆییشدا لە ئارادان، بەڵام ئافرێنراوەکانی سەر بە ئاقاری چالاکییە ئایدیۆلۆژیکەکان هەر تەنیا لە کۆمەڵگاوە بۆ کۆمەڵگا دەردەکەون. بەپێچەوانەی چشتە سروشتییەکان، بابەتمەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە دەرەوەڕا ناخرێنە سەر ئەم ئافرێنراوانە. بنەمابەندییە ئایدیۆلۆژیکەکان بەشێوەیەکی ناوەکی و جەوهەری خاوەنی سروشتێکی

کۆمەڵناسانەن. هیچ کەسێکیش ئەم بابەتە لەمەڕ بیچمە سیاسی و دادوەرییەکان ڕەت ناکاتەوە: چونکە بەڕاستی کام جەوهەری ناوەکی و ناکۆمەڵناسانەیان تێدا دەدۆزرێتەوە؟ جیاوازییە شێوەیی هەرە ناسکەکانی ماف و بنەمای سیاسی تەنیا لەگەڵ ڕێبازی کۆمەڵناسانەدا – هەر تەنیا لەگەڵ ئەمەدا – لێکدەدرێتەوە. دەکرێ هەر ئەم بابەتەش دەربارەی شێوە ئایدیۆلۆژیکەکان بە ڕاست دابنرێ. سەرلەبەری ئەمانە، یەکسەر، سروشتی کۆمەڵناسانەیان هەیە، بەڵام بنەمای بگۆڕ و ئاڵۆزیان بە ئاستەمی دەخرێتە بەر شیکارییەکی وردەوە.

هونەریش بە شێوەیەکی ناوەکی و جەوهەری، کۆمەڵایەتییە: کاتێ ژینگەی کۆمەڵایەتی دەرەوە– هونەری لەدەرەوەڕا کار لە هونەر دەکا، لەوێدا ڕووبەڕووی زایەڵەیەکی ناوەکی و خێرا دەبێتەوە. ئەمانەش بەهیچ جۆرێ دوو هۆکاری بیانی نین کە لەسەر یەکتر کاریگەری بە جێبهێڵن؛ لێرەدا بنەمابەندییەکی کۆمەڵایەتی کار لە بنەمابەندییەکی دیکە دەکات. جوانیناسی، ڕێوڕاست وەکو ئەوەی پێوەندیی بە بنەمابەندیی کۆمەڵایەتییەوە هەبێ، شتێ نییە جگە لە شێوەیەکی تایبەت لە بابەتی کۆمەڵایەتی. بەم بۆنەشەوەیە کە تیۆریی هونەر مومکین نییە شتێک بێ جگە لە کۆمەڵناسیی هونەر، کەواتە هیچ چەشنە پرسیارێکی "ناوەکی" لە ئارادا نییە کە پێویستی بە وەڵام بێ.



## (٢)

کاربردی ڕاستەقینە و سوودبەخشی شیکاریی کۆمەڵناسانە لە تیۆریی هونەر و بەتایبەت لە بوتیقادا، پێویستی بە وەلانانی دوو ڕوانگەی پڕ لە هەڵەوە هەیە کە هەردووکیان هەندێ لایەنی هونەر جیادەکەنەوە و بەم چەشنەش، پانتایی هونەر سنووردار دەکەنەوە.

ڕوانگەی یەکەم دەکرێ بەم شێوەیە پێناسە بکرێت: بتئاسا کردنەوەی بەرهەمی هونەری وەکو چشت کە ئەوڕۆکە ئەم ڕوانگەیە بەسەر تیۆریی هونەردا زاڵە. توێژەرەوە، پانتایی توێژینەوەکەی خۆی هەر تەنیا بۆ بەرهەمەکە سنووردار دەکاتەوە. ئەمەش بەشێوەیەکە کە دەڵێی سەرجەم ئاقاری هونەر هەر لەم بەرهەمەدا کورت کراوەتەوە. بەم چەشنە، ئافرێنەر و وەرگرانی بەرهەمی هونەری دەخرێنە دەرەوەی بەستێنی توێژینەوەکەوە. لە هەمبەر ئەم هەڵسوکەوتەدا، ڕوانگەی دووهەم پانتایی توێژینەوەکەی خۆی تەنیا لە زەینییەتی ئافرێنەر، یان وەرگرانی بەرهەمی هونەری کۆ دەکاتەوە و زۆربەی کاتیش ئەم بابەتە لە ئاکامدا دەبێتە هۆی یەکگرتنەوەیان. کەواتە، لەلایەکەوە هەر تەنیا بنەما و پێکهاتەی بەرهەمەکە لە پێگەی چشتدا دەبێتە بابەتی توێژینەوە و، لەلایەکی تریشەوە، هەر تەنیا زەینیەتی تاکەکەسی ئافرێنەر یان وەرگری بەرهەمەکەیە کە دەبێتە بابەتی بەرباس.

ڕوانگەی یەکەم، لێکدانەوەی هونەر و کەرەستەکان دەخاتە سەرووی توێژینەوەی جوانیناسانەوە. لەم دۆخەدا، شێوە بە مانا

سنووردارەکەی- وەکو شێوەی ئەو کەرەستانەی کە بیچمی چشتێکی تاک و داخراویان بەخشیوەتە هونەر- دەبێتە بابەتی سەرەکی و تارادەیەکیش هەر تایبەت بە توێژینەوەکە.

ئەوەی بە "ڕێبازی شێوەیی" ناوی لێدەبرێ یەکێکە لە گێڕانەوەکانی ڕوانگەی یەکەم. بە پێی ئەم ڕوانینە، بەرهەمی ئەدەبی کەرەستەیەکی گوتەییە کە شێوە بە جۆرێ لە جۆرەکان بیچمی داوەتێ. هەڵبەت لێرەشدا گوتار وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵناسانە دەرناکەوێ، بەڵکو دەبێ لە ڕوانگەی زمانناسیی دەرهەستەوە ڕەچاو بکرێ. وەها ڕوانگەیەک بە تەواوی ڕەوا دێتە بەرچاو، چونکە ئەگەر گوتار بە مانایەکی بەربڵاوتر، بەوێنەی دیاردەی پێوەندیی کولتووری دابندرێ، لە ڕواڵەتی چشتێکی خۆبژێو تێدەپەڕی و چیدی ناکرێ جیا لەو دۆخە کۆمەڵایەتییەی هەڵی دەخرێنێ لێکبدرێتەوە.

بەڵام ناتوانین تا کۆتایی ژیان پاڵ بە وەها تێگەیشتنێکەوە بدەین و لە هەمان کاتیشدا تووشیاری دژایەتی نەبین. بەراستی ئەگەر تەنیا بە وێنەی "چشت" بۆ هونەر بڕوانین، تەنانەت ناتوانین سنوورەکانی کەرەستەی بەرباسیش دەستنیشان بکەین‌و، یان ئەو لایەنانەی بایەخی جوانیناسانەیان هەیە دەرببڕین. کەرەستەی هونەری، لە پێگەی چشتدا، لەگەڵ ژینگەی ئەوپەڕ-هونەریی دەرەوەی خۆیدا تێکەڵ دەبێ و ژمارەیەکی زۆری لایەن و بابەتمەندیش دەگرێتەخۆ: ئەم لایەن و بابەتانە خاوەن سروشتێکی بیرکارانە، فیزیکی، کیمیایی و لە ئاکامدا زمانناسانەن. ئەوەی کە ئێمە خۆمان بەتەواوی بۆ لێکدانەوەی سەرجەم تایبەتمەندییەکانی کەرەستەی هونەری و سەرلەبەری تێکەڵاوییەکانی ئەم تایبەتمەندییانە تەرخان دەکەین، کارێکی سوودبەخش نییە، چونکە هیچ کات ناتوانین لە واتای



جوانیناسانەیان تێبگەین، مەگەر ئەوەی کە بەشێوەیەکی نهێنی و دەستکرد باس لە ڕوانگەیەکی دیکە بکەین کە ئیتر پێوەندیی بە چوارچێوەیی شیکاریی کەرەستە هونەرییەکەوە دەبێ. بەم شێوەیەو بەمەبەستی تێگەیشتن لە گرنگایەتی و بایەخی چشتێک وەکو شمەک، ئیدی هیچکات شیکاریی بینای کیمیایی ئەو چشتە کاریگەر نابێ، چونکە تێگەیینی ئەم بایەخە هەر تەنیا لەبەر تیشکی لێکدانەوەیەکی ئابووریدا سەر دەگرێ.

هەوڵ و تەقەلاکانی ڕوانگەی دووەمیش، کە خوازیاری دەستنیشانکردنی جوانیناسی لە زەینیەتی داهێنەر یان وەرگری هونەرەکەدایە، هەر بەو چەشنەی سەرەوە ناتوانێ سوود بەخش بێ. لەدرێژەی بەراوردکاریی هونەر و ئابووریدا، دەکرێ بوترێ کە تەقەلای ڕوانگەی دووهەم وەکو ئەوەیە کە هەولبدەین لەرێگەی شیکاریی زەینیەتی تاکەکەسیی پرۆلتاریاوە، لەئاکامدا بگەیینە دۆزینەوەی پێوەندییە بابەتیانەکان کە دابینکەری پێگەی ئەون لە کۆمەڵگادایە.

هەر دوو ڕوانگەکە لە دواشیکاریی خۆیاندا تووشی یەک هەڵە دەبن: مەبەستیان دۆزینەوەی **گشت** لە **پاژ**دایە و بنەمای **پاژ**، کە بۆ خۆی لەرێبازی دەرهەستکارییەوە لە گشت کێشراوەتە دەرەوە، وەکو بنەمای خودی **گشت** ئاراستە دەکەن. بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە، دیاردەی **هونەری** لە هاماوی خۆیدا نە لە چشتدایە و، نەک لە زەینییەتی ئافرێنەردا - کە بە شێوەیەکی جیا و تایبەت ڕەچاوکراوە - تەنانەت لە زەینیەتی وەرگری هونەریشدا نییە، بەڵکو هەر سێ لایەنەکە پێکەوە لە خۆ دەگرێ. دیاردەی هونەری، شێوەیەکی تایبەت

و دیاریکراوی پێوەندیی دوولایەنەی هونەرداهێن و هونەروەرگر لە بەرهەمی هونەریدایە.

کەواتە پێوەندیی هونەری رەگوریشەی لە ژێرخانێکدایە کە ئاخێزگەی هاوبەشی ئەم پێوەندییە لەگەڵ شێوە کۆمەڵایەتییەکانیتردایە کەچی رێوڕاست وەکو شێوەکانی تر، خاوەن تایبەتمەندیی دیاریکراوی خۆیەتی: پێوەندیی هونەری، جۆرێکی دیاریکراوی پێوەندییە کە خاوەن شێوەیەکی زۆر تایبەتە. هەر بۆیە، ئەرکی بوتیقای کۆمەڵناسانە تێگەیینی ئەم شێوە تایبەتەی پێوەندیی کۆمەڵایەتییە کە لە کەرەستەی بەرهەمی هونەریدا بەدیهاتووە و مسۆگەر بووە.

بەرهەمی هونەری، لەدەرەوەی ئەم بازنەی پێوەندییەدا و جیا لەوە، بەراستی، شتێ نییە مەگەر یەکێ لە چشتەکانی جیهانی ماکی؛ یان هەر تەنیا هەولێکی زمانناسانەیە و تەنیا لە رەوتی کردارو پەرچەکرداری نێوان هونەرداهێن و هونەروەرگردایە کە بەراستی دەگۆردرێ و دەبێتە بەرهەمێکی هونەری. بەرهەم لە پێگەی ساتێکی سەرەکی لە روودانی ئەم کردار و پەرچەکردارەدایە. کەرەستەی بەرهەمی هونەری، کە نەتوانێ بچێتە نێو بازنەی پێوەندیی نێوان هونەرداهێن و هونەر وەرگرەوە، ئەوەی کە نەتوانێ ببێتە **نێوەنج** یان **بەستێن**-ی ئەم پێوەندییە، هەر ناتوانێ خاوەن واتایەکی هونەریش بێ.

هەندێ رێباز لە ئارادان کە جەوهەری کۆمەڵایەتی هونەر پشتگوێ دەخەن و هەوڵدەدەن سروشت و تایبەتمەندییەکانی تەنیا لە بینای هونەرەکەدا کە وەکو **چشت** رەچاوکراوە، دەستنیشان بکەن. ئەم رێبازانە بەراستی ناچارن کە پێوەندیی کۆمەڵایەتی دوولایەنەی



هونەرداهێن و هونەروەرگر بۆ لایەنە جیاجیاکانی کەرەستە هونەرییەکان و شێوەگەلی بیچم بەخشین بەو کەرەستانە تێپەڕێنن. جوانیناسیی دەروونناسانەش هەر ئەم کارە دەکات و پێوەندیی هونەرداهێن و هونەروەگر بۆ زەینییەتی تاکەکەسیی هونەروەرگر تێدەپەڕێنێ. ئەم جۆرە تێپەراندنە، بێگەردیی رەهای پێوەندییەکە خەوشدار دەکاو تێگەیینێکی ناراستەقینە لە کەرەستە هونەرییەکان و زەینییەتی هونەرمەند ئاراستە دەکات.

ئەو پێوەندییە جوانیناسانەیە کە لە بەرهەمی هونەریدا هاتۆتە گۆڕێ، هەروەها کە پێشتر وترا، پێوەندییەکی تەواو تایبەتە و ناکرێ بۆ جۆرەکانی دیکەی پێوەندیی ئایدیۆلۆژیکی دابمەزێندرێ (وەک پێوەندیی سیاسی، یاسایی، ئەخلاقی و لەم چەشنە). گەرچی بازنەی پێوەندیی سیاسی دەبێتە هۆی بەدیهاتنی رێکخراوە و شێوە یاساییە پێوەندیدارەکانی خۆی، بەڵام بازنەی پێوەندیی جوانیناسانە هەر تەنیا بەرهەمی هونەری چێدەکات. ئەگەر ئەم پێوەندییە ئەو ئەرکە بەرێوە نەبا و تەنانەت بەشێوەیەکی تێپەڕ و خێراش نەبێتە هۆی سازدانی چوارچێوەیەکی سیاسی یان هەر شێوەیەکی ئایدیۆلۆژیک، کەواتە ئیدی ئەوە پێوەندییەکی جوانیناسانە نییە و، بەم پێیەش، ئیتر ناتوانێ بۆ خۆی لە ئارادا بێ. تایبەتمەندیی بەرچاو و سەرەکیی پێوەندیی جوانیناسانە بە راستی لەوەدایە کە ئەم پێوەندییە لە ئافراندنی بەرهەمی هونەریدا و لە نوێبوونەوەی بەردەوامی بەرهەم لەرێگەی وەرگرتنی هاوداهێنەرەکانەوە (واتە، دەوری ئافرێنەری هونەروەرگر) بەتەواوی دێتە دی و پێویستی بە دیاریکردنی بابەتێتییەکی تر نییە. بەڵام ئەم شێوە تایبەتەی پێوەندی، بێگومان، تاکوتەرا نییە. بنج و بناوانی پێوەندیی جوانیناسانە لە یەکپارچە بوونی شەپۆلە

بەربڵاوەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدایە و ژێرخانی ئابووریی گشتی لە خۆیدا دەنوێنێتەوەو، لەگەڵ شێوەکانی تری پێوەندیدا، لە رەوتی کردار و پەرچەکردار و گۆڕینەوەی هێزو و وزەدا، پێوەندییەک سازدەکات. ئەرکی ئێمە ئەوەیە هەوڵبدەین لە شێوەی ئەو گوزارە شاعیرانەیە کە لە پێگەی شێوەیەکی تایبەتی پێوەندیی جوانیناسانەدایەو لە کەرەستە گوتەییەکاندا دەردەکەوێ تێبگەین. بەڵام ئەنجامدانی ئەم کارە بەندە بە لێکدانەوەی بەرچاو و دیارتری هەندێ لایەنی گوزارەی سەر زارەکی- لە گوتاری ژیانی رۆژانەدا - کە پێوەندیی بە ئاقاری هونەرەوە نییە. پێویستیی ئەم لێکدانەوەیە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ کە بنیات و تواناکانی شێوەی هونەریی دادێ هەر لەم گوزارەیەدا دانراوە. جەوهەر و بەهای کۆمەڵایەتی وشە لێرەدا- لە گوتاری ژیانی رۆژانەدا- بە ئاشکرایی و راشکاویی زۆرترەوە دەکەوێتەروو و لێکدانەوەی ئەو پێوەندییەی کە گوزارە بە ژینگەی کۆمەڵایەتییەوە گرێدەدا، گەلەک ساکارتر دەبێت

**(٣)**

تەواو بەڵگە نەویستە کە گوتار لە ژیانی رۆژانەدا خۆبژێو نییە و لە دۆخێکی واقیعی و لە و ژیانەدا دێتە بەرهەم کە خاوەن سروشتێکی دەر-گوتەییە و کورتترین پێوەندییەکانیش لەگەڵیدا دەپارێزێ. جگە لەمەش، هەر ئەم دۆخە واقیعییە، گوتار بەشێوەیەکی بێنێوەنج کاملدەکات و ئەگەر گوتار لێی جیابێتەوە، بەناچار ماناکەی خۆی



دەدۆڕێنێ. ئێمە زۆربەی کات گوزارەکانی ژیانی رۆژانە بەم شێوەیەی خوارەوە هەڵدەسەنگێنین و ناویان لێدەبەین: "ئەمە درۆیە"، "ئەمە راستە"، "چ قسەیەکی باشە"، "نابێ چیدی لەم قسانە بکرێ" و... . سەرجەم ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنانە، جیا لە پێوەری داوەریکردنیان- وەک پێوەرگەلی سیاسی، زانیاریناسانە، ئەخلاقی یان لەم تاقمە - هەڵگری شتێکی زۆرتر لە ناوەرۆکی لایەنی گوتەیی و زمانناسانەی گوزارەن: ئەمانە هاوکات، گوتە و دۆخی دەر-گوتەیی گوزارە لە خۆ دەگرن.

ئەم داوەری و هەڵسەنگاندنانە پێوەندییان بەگشتێتییەکەوەیە کە لەوێ گوتار بە رووداوێک لە ناو ژیاندا گرێی خواردووەو، تێکەڵیشی دەبێ تاکو یەکێتییەکی جیانەکراو بەدی بهێنێ. گوتاریش بۆ خۆی ئەگەر بەشێوەیەکی جیا و تاک، وەک دیاردەیەکی تەنیا زمانناسە رەچاوبکرێ، ناتوانێ راست یان هەڵە و روودارانە و یان کەمڕوویانە بێ.

بەڵام، پێوەندیی گوتاری رۆژانە بەدۆخی دەرگوتەیی ئافرێنەرەکەیەوە چلۆن دێتەگۆڕێ؟ بە مەبەستی لێکدانەوەی ئەم بابەتە نموونەیەک هەڵدەبژێرین کە بەئەنقەست ساکار کراوەتەوە:

دوو کەس لە ژوورێکدان. بێدەنگی زاڵە. پاشان یەکێکیان دەڵێ: "ئەی!" گوزارەی "ئەی" ئەگەر بەشێوەیەکی تاک و جیاواز رەچاوبکرێ، پووچەڵ و بێ مانایە، بەڵام وێرای ئەوەش، ئەم وتووێژە سەیرە کە تەنیا یەک واژەی گرتۆتە خۆی- بەڵام بەراستی بەشێوەیەکی زۆر پڕمانا دەربڕدراوە- لێوانلێوە لە ماناو واتا و هیچ کەموکورییەکیشی نییە. بۆ روونکردنەوەی ماناو واتای ئەم وتووێژە ناچارین هەڵی بسەنگێنین بەڵام بەراستی لەوەها دۆخێکدا ئێمە دەتوانین لەچی بۆ هەڵسەنگاندنەکەمان کەڵک وەربگرین؟ ئەگەر بۆ تەنیا بەشی گوتەیی ئەم گوزارەیە لە هەموو

روویەکەوە بڕوانین‌و لێکی بدەینەوە و لایەنە دەنگی و ڕێزمانی و ماناییەکانی وشەی "ئەی" بە وردییەکی تەواویشەوە دەستنیشان بکەین، تەنانەت بە ئەندازەی دەنکە جۆیەکیش لە تێگەیینی گشتگیری ئەم وتووێژە نزیک نابینەوە.

گریمان لەحنی دەربڕینی وشەکەمان بۆ ناسراوە: لەحنی سەرکۆنەکردنێکی توند و تەنانەت تۆزێکیش بە تیزوتوانجەوە. ئەم ناسینەوەیە، بۆشایی مانایی بەدیهاتوو لە دەنگی "ئەی"یەوە تا ڕادەیەک پڕ دەکاتەوە، بەڵام لە ئاکامدا مانای کۆی گفتوگۆکە ئاشکرا ناکاتەوە:

کەواتە لێرەدا چ شتێک کەمە و لە ئارادا نییە؟ وڵامەکە بریتییە لە **بەستێنی دەرگوتەیی**، کە لە ناخیدا وشەی "ئەی" بۆ بیسەرەکەی خاوەن مانایە. ئەم بەستێنی دەرگوتەییەی گوزارە بەسەر سێ لایەندا دابەشدەکرێ:

١. ئاسۆی شوێنداری هاوبەش بۆ وتووێژکەران (یەکێتی شوێنی هەستپێکراو: ژوور، پەنجەرە و..هتد).
٢. ناسین و تێگەیشتن لە دۆخ، کە ئەوەش بۆ هەردوو وتووێژکەرەکە هاوبەشە.
٣. هەڵسەنگاندنی هاوبەشی ئەوان لەم دۆخە.

لەکاتی ڕوودانی ئەم وتووێژەدا، ئەو دوو پیاوە ئاورێک لە پەنجەرەکە دەدەنەوەو دەبینین کە بەفر دەبارێ. هەردووکیشیان دەزانن کە ئێستا مانگی مەی- یەو، بەهار دەمێکە هاتووە و کەواتە، هەردووکیان لەم زستانە ماندوون کەدوایی نایەت. هەردوو پەرۆشانە چاوەڕێی هاتنی بەهارن و هەردووکیان ناڕاحەتن لەوەی کەهێشتا بەفر دەبارێ. لەسەر بناغەی وەها کۆیەکەوەیە کە **ئاسۆی هاوبەش** (دەنکەکانی بەفر)، **زانیاریی هاوبەش** (کات: مانگی مەی) و **هەڵسەنگاندنی هاوبەش**



(خواستی بارکردنی زستان و هاتنی بەهار) بیچم دەگرن و گوزارەش بەشێوەیەکی بێ نێوەنج لەسەر وەها کۆیەک دادەمەزرێ. مانای زیندووی ئەم گوزارەیە کۆیەکی لەخۆگرتووە و لە خۆیشیدا تواندوویەتییەوە. سەرەڕای ئەمانەش، ئەم بابەتە ماوەتەوە بوترێ و دەرنەبردراوە. دەنکەکانی بەفر لە پشتی پەنجەرەکەوەن، ساتی ڕوودانی قسەکردن لە لاپەڕەی ڕۆژژمێر کەندراوە و هەڵسەنگاندنەکەش لە زەینی بێژەرەکەدایە، بەڵام سەرجەم ئەم کۆیە بە شێوەیەکی پاڵەکی لە وشەی "ئەی"دا شاردراوەتەوە.

ئێستاکە لەم "چەمکی شاراوە"یە تێگەیشتین، واتە کاتێ زانیمان ئاسۆی شوێنی و مانایی هەردووکیان چییە، هەم مانای گشتگیری گوزارەی "ئەی" بەباشی دەناسین و هەم لەحنی دەربڕینەکەش.

بەڵام چ پێوەندییەک ئاسۆی دەر-گوتەیی بەخودی گوتارەوە، یان "نەوتراو" بەو شتەی وتراوە گرێ دەدا؟ بەر لەهەر شتێ، بەتەواوی ئاشکرایە کە گوتار، لێرەدا دۆخی دەرگوتەیی بەو چەشنەی ئاوێنە چشتێک دەنوێنێتەوە ناخاتەڕوو. لەم ساتەدا باشتر وایە بوترێ گوتار، دۆخەکە کامڵدەکا. بەواتایەکی دیکە، گرێبەستە بەهاییەکەی خۆی ئاراستە دەکات. گوزارەکانی ژیانی ڕۆژانە لە زۆربەی کاتەکاندا، بەشێوەیەکی چالاکانە دۆخەکە بەهێز دەکەن و بەربڵاوی دەکەنەوە و گەڵاڵەی داهاتووی بۆ دادەڕێژن. بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە جێگەی بایەخە، لایەنێکی دیکەی گوزارەی ڕۆژانەیە: ئەم گوزارەیە، هەرچییەک بێت، ئەو کەسانەی لە یەک دۆخدا جێگیربوونە، بەشێوەی بەشداربووانێک کە یەک ناسین و تێگەیین و هەڵسەنگاندنیان لەم دۆخە هەیە، پێکەوە گرێ دەدا.

کەواتە، گوزارە لەسەر گیرۆدەیی واقیعی و ماددیی ئەم بەشداربووانە بە بەشێک لە کیان و بوونەوە دامەزراوە و دەربڕین و بەربڵاوییەکی

ئایدیۆلۆژیکی تازە دەبەخشێتە ئەم هاوبەشییە ماددییە، بە شێوەیەک کە دۆخی دەرگوتەیی بەهیچ جۆرێ هۆکاری دەرەکیی گوزارە نییە و بە شێوەی وزەیەکی میکانیکی لە دەرەوەڕا کاریگەرێتی لەسەر دانانێ. بەپێچەوانەوە، ئەم دۆخە، بەشێوەی توخمێکی پێویست بۆ بەردەوامیی مانایی گوزارە تێکەڵی دەبێ. کەواتە، گوزارەی رۆژانە لە پێگەی گشتێکی ماناداردا بە سەر دوو بەشدا دابەشدەکرێ:

١. بەشی گوتەیی بەدیهاتوو و (وتراو)

٢. بەشی شاراوە و (نەوتراو):

بەم بۆنەشەوەیە کە دەکرێ گوزارەی رۆژانە بە "بەراوردکاریی خود" بشوبهێندرێ[٥].

بەڵام ئەمە جۆرێکی تایبەت لە بەراوردکاریی خودە. ئەم وشەیە (کە لە زمانی یۆنانیدا مانەکەی "ئامادەبوون لە کیاندا"'یە) و تەنانەت وشەی "واتای پاڵەکی"یش زایەڵەیەکی زۆر دەروونناسانەیان هەیە. لەوانەشە وا بزانرێ کە دۆخی دەرگوتەیی، لە رواڵەتی کردەیەکی زەینی و دەروونی (وێناکان، ئەندێشەکان، هەستەکان) کە لە زەینی بێژەردا روودەدات، ئاراستە کراوە، بەڵام قەت بەم شێوەیە نییە. هۆکاری تاکەکەسی و زەینی لە بەرامبەر هۆکاری کۆمەڵایەتی و بابەتیانەدا وندەبن. ئەوەی من دەیزانم، ئەوەی دەیبینم، ئەوەی دەمەوێ و ئەوەی خۆشم دەوێ، ناکرێن پاڵەکی بن. تەنیا ئەو شتەی دەتوانرێ بۆ بەشی پاڵەکیی گوزارەکە بگۆردرێ کە ئێمە، بێژەران، هەموومان دەیناسین و دەیبینین و

٥. (Enthymemel) بەراوردکاریی خود یان بەراوردکاریی خودەکان لە لۆژیکدا، بەراوردکارییەکە کە بەشە گەورەکەی دەرنەبردراو و شاراوە بێ، وەک: سوکرات مرۆڤە، کەواتە دەمرێ. بەشی گەورەی نەوتراو و شاراوە لەم بەراوردکارییەدا بریتییە لە: هەموو مرۆڤەکان دەمرن.



خۆشمان دەوێ و دەیناسینەوە، شتێ کە بۆ هەموومان هاوبەشە و پێکەوە گرێمان دەدا. لە پاڵ ئەمەشدا، هۆکاری کۆمەڵایەتی لە بنەرەت و جەوهەری خۆیدا سەرانسەر بابەتیانەیە: شتێ نییە جگە لە یەکێتی ماددیی جیهان، کە دەچێتە نێو دیدی بێژەرانەوە (لە نموونەکەی خۆماندا، ژوورێک کە ئەو دوو کەسە لەوێن، دەنکەکانی بەفر لە پشتی پەنجەرەدا) و تەنانەت یەکیەتی بارودۆخی راستەقینەی ژیان – ئەو یەکێتییەی دەبێتە هۆی هاوبەشێتی هەڵسەنگاندنە جۆراوجۆرەکان (ئەوەی کە – بێژەران سەر بەیەکە بنەماڵەن، سەر بەیەک پیشە و چینی کۆمەڵایەتی و لە ئاکامدا سەر بەیەک سەردەمن). کەواتە هەڵسەنگاندنە پاڵەکییەکان، ئاکامی کارتێکراوییە تاکەکەسییەکان نین، بەڵکو لە باری کۆمەڵایەتییەوە هەندێ کردەوەی بەکۆمەڵی دیاریکراو و پێویستن.

کارتێکراوییە تاکەکەسییەکان لەوانەشە هەر تەنیا جۆرێ هاوئاهەنگی بن کە هاورێی مایەی سەرەکیی هەڵسەنگاندنی کۆمەڵایەتین: "من" لە گوتاردا نایەتە گۆرێ مەگەر ئەوەی "ئێمە"ش رەچاوکرابێ.

کەواتە، هەر گوزارەیەکی رۆژانە، جۆرێکە لە بەراوردکاریی خودی بابەتیانە و کۆمەڵایەتی و ، وەکو ئەو "ناوە هێماییە"یە کە تەنیا بۆ ئەو کەسانەی ئاشنایە کە لە یەک ئاسۆی کۆمەڵایەتیدان. تایبەتمەندیی گوزارە رۆژانەکان هەر لەم بابەتەدا شاردراوەتەوە: ئەوان بە هەزاران رستەوە لکاون بە بەستێنی دەرگوتەییەوە و گەر لەم بەستێنە جیا بکرێنەوە، تارادەیەک سەرجەم ماناکەی خۆیان لە دەستدەدەن. ئەگەر لەگەڵ بەستێنی زیندوو و بێ نێوەنجی ئەم گوزارانەدا ئاشنا نەبین، ئەوا ناتوانین بیانناسین.

بەڵام زەمینەی بێنێوەنج رەنگە تا رادەیەک بەربڵاو بێ. لەو نموونەیەی سەرەوەدا، ئەم بەستێنە زۆر سنووردارە: "مانای بارینی

بەفر" لە ژوورەکەداو بە پێی ساتی کردەوەکە دیاری دەکرێ و گوزارەکەش هەر تەنیا بۆ ئەو دووکەسە فام دەکرێ. بەڵام ئەم ئاسۆ هاوبەشە کە گوزارە لە سەری دامەزراوە، لەوانەیە لە شوێن و لەکاتدا پەرەبسێنێ: "خاڵی پاڵەکی" دەتوانێ لە ئاستی بنەماڵە، نەتەوە، چینی کۆمەڵایەتی، رۆژەکان، ساتەکان و سەرانسەری سەردەمەکاندا بوونی هەبێ. هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی ئاسۆی هاوبەش و تاقمە کۆمەڵایەتییە گونجاوەکەی، لایەنە پاڵەکییەکانی گوزارەش زۆرتر لە جاران دادەمەزرێن.

ئەگەر ئاسۆی راستەقینەی گوزارە سنووردار بێ و- وەک ئەو نموونەیەی هێنامانەوە- لەگەڵ ئاسۆی دیاریکراوی دووکەسدا رێککەوێ کە لەیەک ژووردان و یەک شت دەبینن، ئینجا خێراترین گۆرانکاریش کە لە ناوەوەی ئەم ئاسۆیەدا رووبدا، دەتوانێ پاڵەکی بێ. بەڵام ئەگەر ئاسۆکە بەربڵاوتر بێ، گوزارەکەش ناتوانێ لەسەر توخمە بەردەوام و نەگۆرەکان و هەڵسەنگاندنە کۆمەڵایەتییە سەرەکی و بنەرەتییەکان دابمەزرێ.

لەم بارودۆخەدا، هەڵسەنگاندنە پاڵەکییەکان مانەگەلێکی زۆر گرنگ دەگرنە خۆ. لە راستیدا، هەڵسەنگاندنە کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکان، کە بەشێوەیەکی بێنێوەنج لە بابەتمەندیگەلی ژیانی ئابووریی تاقمێکی کۆمەڵایەتی دەستنیشانکراوەوە سەرچاوە دەگرن، زۆربەی کات نایەنە دەربرین: ئەوانە لە پێست و خوێنی سەرجەم وێناکانی ئەم تاقمانەدا ئامادەن، کردەوە و ئاکاری تاکەکان رێکدەخەنو، لە راستیدا لەگەڵ هەڵبژاردن و دیاردە رێککەوتووەکانی خۆیاندا تێکەڵ بوونە. بەم بۆنەشەوەیە کە هەڵگری پۆلێنکارییەکی گوتەیی و تایبەت نین. ئەمەش بە شێوەیەکە کە چما ئێمە هاوکات لەگەڵ بوونی خودی چشتەکە،



بایەخەکەشمان لە پێگەی یەکێ لە تایبەتمەندییەکانیدا دەرکپێکردووە. بۆ نموونە، هاوکات لەگەڵ هەستپێکردنی گەرما و رووناکیی هەتاو لە بایەخەکەشی تێدەگەیین. بەم پێیەشە کە سەر لەبەری دیاردەکانی ژیانی دەوروبەری ئێمە تێکەڵی هەڵسەنگاندن بوونە. ئەگەر جەوهەری ژیانی بەکۆمەڵ، لە راستیدا، مەرجی سەرەکیی هەڵسەنگاندن بێ، ئینجا وەک بنەواشەیەکی قایمی بیرو براواکانمان و بەوێنەی شتێکی ئاسایی و بەڵگە نەویست پەسەنددەکرێ بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر هەڵسەنگاندنی سەرەکی دەرببردرێ و بسەلمێندرێ، نیشانەی ئەوەیە کە تۆزێک گومانهەڵگر بۆتەوە و لە بابەتەکەی خۆی جیاکراوەتەوە و چیدی ناتوانێ بیچم ببەخشێ بەژیان. کەواتە، پێوەندییەکەشی لەگەڵ بارودۆخی ژیانی بەکۆمەڵدا پچراوە.

هەڵسەنگاندنی کۆمەڵایەتی رێوراست بەندە بەجەوهەری ژیانەوە. لەسەر ئەم بناخەیەشدایە کە بیچم دەداتە شێوە و لەحنی گوزارەکە. ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە هەر پێویستی بەوە نییە کە لە ناواخنی گوتاردا بە دوای دەربرینێکی شیاو وبەجێدا بگەرێ. هەر کە هەڵسەنگاندن، لەلایەنە شێوەییەکانی گوتارەوە بچێتە ناوەرۆکەکەیەوە (واتە لە دۆخی پاڵەکی بێتە دەرێ و بەئاشکرا دەرببردرێ) دەکرێ بەدڵنیاییەوە بوترێ کە هەڵسەنگاندنێکی نوێ خەریکە بیچم دەگرێ. بەم چەشنە، هەڵسەنگاندنی سەرەکی بەهیچ شێوەیەک لە ناواخنی گوتارەکەدا جێگیر نەبووە و ناکرێ لێی هەڵبگیردرێ. بە پێچەوانەشەوە، هەڵسەنگاندن هەڵبژاردنی وشەکان و بیچمی گشتێتی گوتەیی دابیندەکات و دەربرینی هەرە خاوێنی خۆی لە لەحنی گوتەدا دەدۆزێتەوە. لەحنی گوتە، لە نێوان گوتار و بەستێنی دەرگوتەییدا ، پێوەندییەکی چرووپڕ دێنێتە ئاراوە: بە وتەیەکی تر، گوتار بۆ ئەوپەڕی سنوورە گوتەییەکانی خۆی دەکێشێ.

باشتر وایە لێرەدا بەکەڵک وەرگرتن لەو نموونەیەی پێشتر ئاماژەی بۆ کرا، زۆرتر لەو پێوەندییە بدوێین کە لەحنی گوتە بە بەستێنی ژیانداری دەر-گوتەییەوە گرێدەدا. ئەم بابەتە توانای ئەوەشمان دەداتێ کە هەندێ خاڵی گرنگ دەربارەی جەوهەری کۆمەڵایەتی لەحنی گوتە بخەینەڕوو.

(٤)

لە هەنگاوی یەکەمدا پێویستە ئەوە دەستنیشان بکرێ کە وشەی "ئەی" کە لەباری ماناناسانەوە تارادەیەک بە تەواوی بەتاڵ و بۆش دێتە بەرچاوە، بەهیچ جۆرێ ناتوانێ پێشوەخت لەحن و ناوەرۆکەکەی خۆی دیارییکات: هەر لەحنێک- وەکو ئەوەی کە دەربڕی پەژارە، شایی، سووکایەتی و... هتد بێ- رەنگە بە ساکاری و بەشێوەیەکی رەوا ئەو وشەیە بەکاربهێنێ. هەموو شتێ بەندە بە بەستێنی دەربڕینی وشەکەوە. لەو نموونەیەی ئێمە هێنامانەوە، بەستێنی دیاریکەری لەحنی گوتە - کە لەسەر گوتەیەکی توندو تۆزێکیش بە تیزوتوانجەوە سەری هەڵداوە - بەرهەمی دۆخێکی دەرگوتەییە کە لە سەرەوەڕا لێکدرایەوە. بەستێنی گوتەیی بەبێ نێوەنج بوونی نییە. هەر لێرەشەوە دەکرێ بوترێ کە تەنانەت کاتێکیش ئەم بەستێنە کۆمەڵایەتییە بێ نێوەنجە لە گۆڕێدایە و لە هەموو رووییەکیشەوە بەگشتی بەشێوەیەکی خۆبژێو دێتە بەرچاو، لەحنەکەی ئێمە بۆ ئەوپەڕی سنوورەکانی خۆی دەبات: لەحنەکە ناتوانرێ بە تەواوی فامبکرێ مەگەر ئەوەی کە ئەو هەڵسەنگاندنە



پاڵەکییەی تاقمی کۆمەڵایەتی بەرباس-هەر چەند بەربڵاویش بێ- بناسێنرێ. لەحن بەردەوام لە سنووری هۆکاری گوتەیی و ناگوتەیی و لە سنووری وتراو و نەوتراودا جێگیر دەبێ. لە لەحندا، گوتار پێوەندیی راستەوخۆی بە ژیانەوە هەیە. لە پلەی یەکەمیشدا، لە لەحندایە کە بێژەر لەگەڵ بیسەراندا پێوەندیی سازدەکات: لەحن تا رادەیەکی زۆر کۆمەڵایەتییە و سەرجەم گۆڕانکارییەکانی ژینگەی کۆمەڵایەتی کاری لێدەکەن.

لە بابەت ئەو نموونەیەی سەرەوە، لەحن لە خواستی هاوبەشی دوو وتووێژەکەرەکەوە بۆ سەیرکردنی هاتنی وەدرەنگ کەتنی بەهار و لە رقی هاوبەشیانەوە - بەهۆی بەردەوامبوونی زستانەوە سەرچاوە دەگرێ. ئاشکرایی و پتەویی دەنگە سەرەکییەکە هەر لەسەر ئەم هاوبەشییەی هەڵسەنگاندنە پاڵەکییەکان دامەزراوە و لە ژینگەی لێک تێگەیشتن و خوازیاریدایە کە توانیویەتی بە ئازادی و سەربەستی بکەوێتە گەڕ و لە سنووری دەنگە سەرەکییەکەی خۆیدا بکەوێتە بەرچاو. بەڵام ئەگەر هەستی دڵنیایی لەم "پشتیوانە کۆیی"یەدا تا ئەو ئاستە پتەو نەبووبایە، لەحنەکە ئاراستەیەکی دیکەی لەخۆ دەگرت و پڕ دەبوو لە هەندێ دەنگی دیکە (وک دەنگی نائومێدی یان توندوتیژی)، لەوانەشە لە ئاکامدا بڕۆیشتایەتە ناخی خۆیەوە. کاتێ کەسێ وای بۆ دەچێ کە بەردەنگەکەی لەگەڵیدا تەبا نییە، یان لەم تەباییە دڵنیا نییە و لێی دردونگە، لەحنێکی جیاواز دەداتە ئەو شتانەی دەریان دەبڕێ. جگە لەمەش، گوزارەکەی خۆی بەشێوەیەکی جیاوازتر چێدەکات. دوایی، تێدەگەیین کە نەک هەر لەحنی گوتە، بەڵکو سەر لەبەری بنەمای شێوەیی گوتار، تارادەیەکی زۆر بەندە بە پێوەندیی نێوان گوزارە و هاوبەشییەوە، ئەو هاوبەشییەی کە

ئامادەبوونی لە ژینگەی کۆمەڵایەتی بەردەنگی گوتارەکەدا وەکو گریمانەیەک دانراوە. لەحنی ئافرێنەر، کە لە خۆی دڵنیایە و جۆراوجۆریشە، نایەتە دی مەگەر ئەوەی گریمانەبوونی "پشتیوانی کۆیی" لە ئارادا بێ. لەلایەکی ترەوە، لەهەر کوێ ئەم پشتیوانییە ئامادە دەبێ، دەنگ لەرزی لێدەکەوێ و، پڕاوپڕیی لەحنەکانی دێتەخوارێ، وەک ئەو کاتەی پیاوێکی دەم بەبزەوە، تێدەگەیت کە پێکەنینەکەی لەکەسدا پەرە ناسێنێ: لە وەها ساتەوەختێکدا پێکەنینەکەی تەواو دەبێ یان کەم دەبێتە، تان بەشێوەیەکی دەستکرد دەردەکەوێ و خودباوەڕی و روونـاکیی خۆی دەدۆڕێنێ و چیتر ناتوانێ گاڵتە یان هەندێ قسەی خۆش بێنێتە سەر زمان. هاوبەشێتی هەڵسەنگادنە سەرەکییەکان نەخشەیەکە کە گوتاری مرۆڤ بەو پێیە رازاندنەوەی لەحنی گوتەکەی خۆی رێکدەخات. بەڵام لە لەحندا جۆری هاوڕێیەتی و "پشتیوانیی کۆیی" هاماوی سروشتە کۆمەڵایەتییەکەی پیشان نادات. لە لەحندا جگە لەم خوازیارییە بەرەو لای بیسەر، لایەنێکی دیکەش لە ئارادایە کە بۆ کۆمەڵناسیی گوتار زۆر گرنگە.

ئەگەر سەرنج بدەینە لەحنی ئەو گوزارەیەی لە سەرەوە لێکدرایەوە، لەوێڕا تایبەتمەندییەکی **مەتەڵئاسا** دەبینین کە شیاوی لێکدانەوەیەکی تایبەتە. لە لەحنی وشەی "ئەی"دا ئەوەی دێتەگوێ هەر تەنیا نارەحەتی (لە بینینی بارینی بەفر، واتە رووبەڕووبوونەوەیەکی هەڵپەسێردراو) نەبوو، بەڵکو سوور هەڵگەڕان و سەرکۆنەش- واتە رووبەڕووبوونەوەیەکی چالاکانە- لە ئارادا بوو. ئەم سەرکۆنەیە ئاراستەی کێ دەکرا؟ بەردەنگی ئەم سەرکۆنەیە بێگومان بیسەر نەبوو، بەڵکو کەسێکی دیکە بوو. ئەم ئاراستەیە، واتە، هاتووچۆی



لەحنەکە، پانتایی دۆخی دەرگوتەیی پەرەپێدەدات و بۆ بەشداربوویەکی سێیەمیش رێگە ئاوەڵا دەکاتەوە.

بەڵام بەڕاستی ئەم بەشداربووە سێهەمینەی نێو گوزارەکە کێیە؟ سەرکۆنەکە ئاراستەی کێ کراوە؟ ئاراستەی بەفر؟ ئاراستەی سروشت؟ یان لەوانەشە ئاراستەی قەدەرکرابێ؟

هەڵبەت لە گوزارەی رۆژانە و ساکارکاوی ئێمەدا ئەم بەشداربووەی سێهەم کە لە بەرهەمە ئەدەبییەکاندا بە پاڵەوان ناودێرکراوە هێشتا بەتەواوی بیچمی نەگرتووە: لەحنەکە، بەئاشکرایی پێگەکەی پیشاندەدا، بەڵام هێشتا هاوواتایەکی مانایی نەدۆزیوەتەوە و نائومێد نەبووە. لێرەدا لەحن پێوەندییەکی زیندوو و راستەوخۆ لەگەڵ بابەتی گوزارەکەدا سازدەکات: ئەم بابەتە تارادەیەک خراوەتە بەر رەخنە و سەرکۆنەوە، بەشێوەیەک کە دەڵێی تاوانبارە راستەقینەکە زیندووە. بیسەریش- واتە بەشداربووی دووهەم - بەجۆرێ لە پێگەی شایەت و هاوپەیمانێک، قسەی لەگەڵ کراوە.

هەر لەحنێکی گیاندار لە گوتاری زیندووی رۆژانەدا دەڵێی تارادەیەک، وێڕای بابەت و چشتەکان، رووبەڕووی بەشداربووان و خوێنەرانی راستەقینە لە ژیاندا کراوەتەوە و بە "کەسایەتی بەخشین" دیاریکراوە. ئەگەر لەحن - وەک ئەو نموونەیەی باسی لێکرا- لەژێر کاریگەرێتی ئەم توخمانەدا بێ و ئەگەر ساکار و خۆرسک بێ، ئینجا وێنەیەکی ئوستوورەیی، دەستەواژەیەکی جادوویی و جۆرێ نزا هەڵدەخرێنێ و ئەمەش دەقاودەق هەر ئەو شتەیە کە لە یەکەم قۆناغەکانی کولتووردا روودەدات.

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ئەو نموونەیەی خۆمان، تێدەگەیین کەلەوێ لەگەڵ دیاردەیەکی زۆر گرنگدا سەرو کارمان هەیە: لەحن خوازە

دەخولقێنێ و چما سەر کۆنەیەک ئاراستەی گوێی بوونەوەرێکی زیندوو و بەرپرسی هەوای خراپ- واتە زستان- دەکرێ. لێرەدا لەگەڵ خوازەی لەحندا – لە دۆخێکی رەسەندا – بەرەو رووین، بەڵام چما شیمانەی خوازەی مانایی لە لانکەکەی خۆیدا خەوی لێکەوتووە. ئەگەر ئەم شیمانەیە بەدیدەهات، وشەی "ئەی" بەشێوەی دەربڕینێکی خوازەیی پەرەی پێدەدرا، وەک: "چ زستانێکی سەیر و سەمەرەیە: سەرەرای ئەوەی دەمێکە وەختی بەسەرچووە، نایەوێ لە چاوان ونبێ!" بەڵام ئەم ئەگەرە لە لەحندا شاراوەیە و خۆی لە گوزارەکەدا بەدەنگی "ئەی" سنووردار کردۆتەوە کە لەرووی ماناییەوە تارادەیەکیش بۆش و بەتاڵە. پێویستە سەرنج بدرێتە ئەوەش کە لە گوتاری رۆژانەدا، لەحن بەگشتی زۆرتر لە وشە خوازەییەکاندایەو، دەڵێی لێرە رۆحی ئوستوورەسازی مرۆڤی بەرایی هێشتا هەر زیندووە. شتەکان بەشێوەیەک دەکەونە گەڕ کە چما دەوروبەری بێژەر هێشتا پڕاوپڕە لە وزە گیاندارەکان: لەحن هەرەشە دەکات، دەستدەکاتە سەرکۆنە کردن، چشت و دیاردە بێگانەکانی خۆش دەوێ و نەوازشتیان دەکات، کەچی زۆربەی خوازە باوەکان لە زمانی رۆژانەدا سووکایەتیان دەرهەق کراوە و وشەکان، لە باری واتاییەوە، بێ ناوەرۆک و لێڵ و بێبایەخ بوونە.

جۆرە وێکچوونییەک خوازەی لەحن بەخوازەی حاڵەتییەوە گرێدەدا (ئایا هاتوچۆ و حاڵەتی جەستەش بۆ خۆی لە بنەڕەتدا جۆرێ هاتووچۆی زمانناسانە و، توخمێکە لە هاتوچۆیەکی ئاڵۆزتر کە سەرجەم رستەکە لەخۆ دەگرێ؟) هەڵبەت دیارە کە لێرەدا چەمکی حاڵەت بەمانای بەربڵاو بەکار دەبەین کە لەلایەکەوە هەڵگری حاڵەتی روخسار بێ و لەلایەکی تریشەوە حاڵەت و جووڵانەوەی دیکەی



ئەندامەکان بگرێتە خۆ. حاڵەت، رێوراست وەکو لەحن، پێویستی بە پشتیوانیی کۆی دەوروبەری هەیە: حاڵەت و جووڵەی ئازاد و دڵنیا نایەتە دی مەگەر لە ژینگەیەکدا کە تێیدا تەبایی و هاورێیەتی کۆمەڵایەتی هەبێ. لەلایەکی دیکەشەوە، حاڵەت، وەکو لەحن، بەستێنی دۆخی دەر-گوتەیی بەربڵاوتر دەکاتەوە و بەشداربوویەکی سێیەمیش دەهێنێتە نێو بازنەکەوە: پاڵەوان. لە خوازەدا بەردەوام توخمی هێرش یان بەرگری و رق، یان خۆشەویستی حەشاردراوە. بینەر یان بیسەر دەوری هاوپەیمان یان شایەتی یارییەکە دەگێڕن. زۆربەی کات، لەم حاڵەتەدا، ئەوەی دەوری "پاڵەوان" دەگێڕێ، شتێ نییە جگە لە چشتێکی بێگیان، یان دیاردە و دۆخێک لە ژیانی رۆژانەدا. لەزۆربەی دۆخەکاندا، لە تەشقی رق و کینەدا بە مست دەکوتین بە هەوادا، یان ئاورێکی شەرئاژۆیانە لە دەوروبەرمان دەدەینەوە؛ لە هەمبەر ئەمانەشدا دەتوانین بەچەشنێ بەهەموو شتێ پێکەنین، بە خۆرەتاو، دارەکان و بیرەکانمان.

پێویستە بەردەوام ئەو خاڵەمان لە زەیندا بێ (ئەو خاڵەی جوانیناسیی دەروونخواز زۆربەی هەرە زۆری لەبیر دەچێتەوە): لەحن و حاڵەت بەهۆی هۆگریی جەوهەریی خۆیانەوە، چالاک و بابەتیانەن. ئەوان هەر تەنیا حاڵەتی رۆحی هەڵپەسێردراوی بێژەر دەرنابڕن، بەڵکو هەمیشە هەڵگری پێوەندییەکی زیندووو چالاکن لەگەڵ جیهانی دەرەکی و جڤاتی هاورێیاندا (دۆستان، دوژمنان، هاوپەیمانان).

مرۆڤ بە پێی جەوهەری کیانی کۆمەڵایەتی خۆی، لەرێگەی لەحن و حاڵەتەوە، بەشێوەیەکی کۆمەڵایەتی دەستدەکا بەچالاکی و لە هەمبەر هەندێ بەهادا چالاکانە هەڵوێستی خۆی پیشاندەدا.

تیۆری‌داڕێژانی هونەرە ئەدەبییەکان دەبێ سەرنج بدەنە ئەم لایەنە بابەتیانە و کۆمەڵایەتییەی لەحن و حاڵەت و، (تەنیا) ئاوڕ لە لایەنی زەینی و دەروونیی نەدەنەوە، چونکە وزەگەلی جوانیناسانەی ئافراندن کە شێوەی هونەریی ئەم دیاردانە رێک دەخەن و سازیان دەکەن، هەر لەم لایەنەدا جێگیر بوونە.

کەواتە هەر لەحنێک خاوەنی دوو ئاراستەی جیاوازە: سەبارەت بەبێژەر، لە پێگەی هاوپەیمان و یان شایەتدایەو سەبارەت بە بابەتی گوزارەکەش، وەکو سێهەمین بەشداربووی زیندوو دەست دەکاتە سەرکۆنە و نەوازشت، سووکایەتی یان دڕکاندنی بابەتی گوزارە. ئەم خوازیارییە کۆمەڵایەتییە دوو لایەنە، دابینکەرو مانا بەخشی سەرجەم لایەنەکانی لەحنە. بەڵام ئەم بابەتە سەبارەت بەلایەنەکانی‌تری گوزارەی گوتەیش هەر دیسانەوە راستە: سەرلەبەری ئەمانە هەر لە رەوتی خوازیاریی دوولایەنەی بێژەردا ساز دەکرێن و بیچم دەگرن. تاقە جیاوازی لەوەدایە کە لەحن، لەوێوە کە گوتار زۆرترین لایەنگری و هاتووچۆی ئازادی سەبارەت بە لەحن هەیە، ئەم سەرچاوە کۆمەڵایەتییەش بە زووتترین شێوە ئاشکرا دەکاتەوە.

ئێستەکانێ ئیدی مافی وتنی ئەم خاڵەمان هەیە کە هەر وشەیەکی بەڕاستی دەربڕاو- نەک نێژراو لە فەرهەنگی وشەکاندا- دەربڕ و بەرهەمی کردارو پەرچەکرداری کۆمەڵایەتی سێ بەشداربووە: بێژەر (یان نووسەر)، بیسەر (یان خوێنەر)و، کەسێک (یان شتێک) کە بابەتی قسەکەیە (یان پاڵەوان). گوتار، رووداوێکی کۆمەڵایەتییە و، بەپێچەوانەی چەمکە دەرهەستە زمانناسانەکان، خۆبژێو نییە و، ئەگەری ئەوەش لە ئارادا نییە کە لە ئاگایی زەینی - و تاکەکەسی-ی بێژەرەوە شێوەیەکی دەروونناسانە بەرهەم بێ. بەم بۆنەشەوەیە کە



بۆچوونی شێوەیی و زمانناسانە و تەنانەت بۆچوونی دەروونناسانەش، مەبەستی خۆیان پشتگوێ دەخەن. جەوهەری راستەقینەو کۆمەڵناسانەی گوتار کە تاقە دابینکەری راستی یان ناڕاستی، بێ بایەخی یان پڕشکۆیی و، سوودبەخشی یان بێ کەڵکیی گوتارە، لەهەر دوو بۆچوونەکەدا لێک نادرێتەوە و ناخرێتە بەر باسەوە.

بێگومان هەر ئەم "گیانی کۆمەڵایەتی"یەی گوتارەکە لە باری جوانیناسانەوە واتاداری دەکاتەوە- دزێو یان جوان. هەڵبەت ئەم بۆچوونە دەرهەستە - واتە، بۆچوونی شێوەیی زمانناسانە و بۆچوونی دەروونناسانە- تەنیا کاتێ گرنگایەتی خۆیان دەپارێزن کە پێڕەوی لە روانگەی کۆمەڵناسانەش بکەن کە لە راستیدا بنەڕەتی و بەرهەستە. هاوکاریشیان بەتەواوی پێویستە، بەڵام بۆ خۆی و بە شێوەیەکی جیا بایەخی نییە.

گوزارەی بەرهەست و (نەک دەرهەستی زمانی) لە رەوتی کردار و پەرچەکرداری کۆمەڵایەتی بەشداربووانی گوزارەکەدا لە دایکدەبێ، ژیان بەسەر دەباو دەمرێ. ماناو شێوەکەشی لە بنەڕەتدا هەر شێوەو سروشتی ئەم کردارو پەرچەکرارە دابینی دەکات. ئەگەر گوزارە لە بەستێنی پەروەرشتی راستەقینەی خۆی بکێشینە دەرەوە، کلیلی تێگەیشتنی شێوە و ماناکەی ون دەکەین و ئیدی شتێکمان بە دەستەوە نامێنێ جگە لە رووکەش و پێستێک. ئەم پێستەش یان رووکەشی دەرهەستی زمانییە، یان رووکەشی دەرهەستی نموونەی ئەندێشە، واتە، هەمان"ئەندێشەی زاڵ بەسەر بەرهەمدا" کە هەموو کەس دەیزانێ و رێز و شکۆی مێژوونووسانی ئەدەب و تیۆری داڕێژانی بە دواوە بووە. ئەم دوو دەرهەستکارییەش لە رێگەی هیچ

هۆکارێکەوە پێکەوە گرێ نادرێن، چونکە بەستێنی راستەقینەی بەدیهاتنی پێوەندیی زیندووی نێوانیان لە دەست چووە.

ئێستا پێویستە دەست بکەینە ئاراستەکردنی کۆبەندی ئەم شیکارییە کورتەیەمان دەربارەی گوزارەی ژیانی رۆژانە و ئەگەرەکان، توخمەکان و ئەو شێوە و ناوەڕۆکە بەزەبرەی کە لەوێ دۆزیومانەتەوە.

واتای راستەقینە و مانای گوزارە لە ژیانی رۆژانەدا لەگەڵ بینای تەواو گوتەیی گوزارەدا یەک ناگرنەوە. قسە وتراوەکان لێوالێون لە چەمکە پاڵەکی و نەوتراوەکان. ئەوەی بە "تێگەیین" و "هەڵسەنگاندنی گوزارە" (تەبایی یان ناتەبایی لەگەڵیدا) ناوزەد دەکرێ، بەردەوام گوتار و دۆخی راستەقینەی دەر- گوتەیی دەگرێتەخۆ. بەم چەشنە، ژیان لە دەرەوەڕا کار لە گوزارە ناکات، بەڵکوو لە ناوەوەدا دێتە نێو گوزارەوە. ژیان یەکێتی و هاوبەشیی ئەم بووندارێتییەیە کە بێژەرانی گرتۆتەوە و، لە راستیدا یەکبوونی ئەو هەڵسەنگاندنە سەرەکییانەیە کە لەم بووندارێتییەدا رەگیان داکوتاوەو، لە دەرەوەی ئەمانەشدا هیچ گوزارەیەکی مانادار بوونی نییە. لەحن لە سنووری ژیان و بەشی گوتەیی گوزارەدایە و، بەواتایەکی تر، تواناو وزەی دۆخی راستەقینە بۆ گوتار دەگوازێتەوە و، جووڵانەوەیەکی مێژوویی زیندوو و، تایبەتمەندییەکی شازو تاقانە دەبەخشێتە هەر شتێ کە لە باری زمانناسانەوە نەگۆڕە. لە ئاکامدا، گوزارە، کردارو پەرچەکرداری کۆمەڵایەتی بێژەرو بیسەرو پاڵەوان لە خۆیدا دەنوێنێتەوە. گوزارە برێتییە لە ئەنجامی مسۆگەرکراوی پێوەندیی زیندووی ئەمانە لە مادەی گوتەییدا.



گوتار، بە شێوەیەک، "سیناریۆ"ی رووداوێکە. تێگەیینی زیندووی مانای گشتگیری ئەم وشەیە دەبێ ئەم رووداوە دابهێنێتەوە کە برێتییە لە پێوەندیی دوولایەنەی بێژەران و، بەجۆرێ بیهێنێتە "سەرسکۆ"وە. ئەو کەسەی ئەم مانایە بدۆزێتەوە، دەوری بیسەری هەیە و بۆ ئەم مەبەستەش پێویستە لە پێگەو هەڵوێستی بەشداربووانی دیکەش بە باشی تێبگات.

زمانناسیی دەرهەست، بەڵام، نە ئەم رووداوە دەبینێ و، نەک بەشداربووانیش هەست پێدەکات. زمانناسی لە رەسەنترین باری خۆیدا، سەر و کاری لەگەڵ گوتاری دەرهەستدایە و، پێوەندیی بە لایەنە جیاجیاکانی ئەم گوتارەوە هەیە کە ئەوانیش بۆ خۆیان سەر لەبەر دەرهەستن (لایەنە دەنگناسانە و رێزمانییەکان و... هتد). بەم بۆنەشەوەیە کە مانای گشتگیری گوتار و بەها ئایدیۆلۆژیکییەکەی - زانیاریناسانە، سیاسی، جوانیناسانە- بۆ ئەم بۆچوونە دەست نادەن و لە ئارادانین. هەروەها کە ئەگەری بوونی لۆژیک یان سیاسەتی زمانناسانە لە گۆڕێدا نییە، هەر بەهەمان شێوەش بوتیقای زمانناسە نامومکینە.

## (٥)

گوزارەی گوتەیی هونەری- بەرهەمی یەکسەر ئەدەبی - چ جیاوازییەکی لەگەڵ گوزارەی رۆژانەدا هەیە؟ لە یەکەم هەنگاودا ئاشکرایە کە لە گوزارەی هونەریدا، بەپێچەوانەی گوزارەی رۆژانە، پێبەندیی گوتار بە کۆی هۆکارەکانی بەستێنی دەر- گوتەیی و بەکۆی

بینراوو ناسێنراوە بێنوەنجەکانەوە زۆر چڕ نییە و، ناشتوانێ وەها بێ. بەرهەمی ئەدەبی ناتوانێ وەکوو شتێکی ئاشکرا و لەخۆڕا، بەبێ کەمترین ئاماژە بۆ ئەم ڕووداوانە، لە بەشی گوتەیی گوزارەدا – بەند بێ بە ڕووداوەکانی ژینگەیەکی بێنێوەنجەوە. لەم ڕوانگەیەوە، گوتار لە ئەدەبدا بەندە بەهەندێ پێویستیی بەربڵاوترەوە: بەشێکی گرنگی ئەوەی لە ژیانی دەرەوەی سنوورەکانی گوزارەدا دەمێنێتەوە ئێستا دەبێ دەرکەوتەیەکی گوتەیی بۆ خۆی دەستەبەر بکات. لەڕوانگەی بابەتیانەو زانستییەوە، هیچ چەشنە خاڵێکی دەرنەبڕاو نابێ لە بەرهەمی ئەدەبیدا لە گۆڕێدا بێ.

ئاخۆ دەبێ بەو دەرەنجامە بگەین کە لە ئەدەبدا، بێژەر و بیسەرو پاڵەوان بۆ جاری یەکەم کۆدەبنەوە بەبێ ئەوەی کە هیچ شتێ لە یەکتر بزانن یان، خاوەن ئاسۆیەکی هاوبەش بن، واتە هیچ شوێنێکی پشتیوانی یان هیچ خاڵێکی پاڵەکی و هاوبەشیان نییە؟ هزری چەند کەسێک بۆ پەسندکردنی ئەم ڕوانگەیە دەشکێتەوە.

بەرهەمی ئەدەبی، بەڕاستی، بنج و بناوانی قووڵی لە بەستێنی ڕاستەقینەی بابەتی دەرنەبڕدراودایە. گەر بیسەر و پاڵەوان بۆ یەکەمین جار بە ڕاستی بەوێنەی بوونەوەرگەلێکی دەرهەست و دوور لە هەر چەشنە ئاسۆیەکی هاوبەش کۆدەبوونەوە و وشەکانیشیان لە یەک کولتوور دەقۆزتەوە، زۆر بە ئاستەمی دەکرا بیر لەوە بکرێتەوە کە لەم هەڵسووڕانەدا، پەخشانێک و یان، لەوە باشتر، بەرهەمێکی شاعیرانە بێتە بەرهەم. زانست، تاڕادەیەک لەم سنوورە نزیک دەبێتەوە: پێناسەی زانستی بەڕاستی زۆر کەم هەڵگری واتایەکی پاڵەکییە، بەڵام دەکرێ ئەوە پیشانبدرێ کە تەنانەت زانستیش ناتوانێ بەشی پاڵەکی پشتگوێ بخات.



ئەو دەورەی هەڵسەنگاندنی پاڵەکی لە ئەدەبدا دەیگێڕێ، زۆر گرنگە. دەتوانرێ بوترێ، کە بەرهەمی ئەدەبی کورتکراوی بەشی بە هێزی هەڵسەنگاندنە کۆمەڵایەتییە دەرنەبڕاوەکانە: هەر وشەیەک بۆ خۆی لێواولێوە لەم هەڵسەنگاندنانە و، هەر ئەم هەڵسەنگاندنە کۆمەڵایەتییانەن کە شێوەگەلی هونەری لە پێگەی دەربڕینی ڕاستەوخۆی خۆیاندا دەهێننە ئاراوە.

هەڵسەنگاندنەکان، بەر لە هەرشتێ، هەڵبژاردنی وشە لەلایەن نووسەرەوە و ئاگاربوونی بیسەر لەم بابەتە دابیندەکەن. لە ڕاستیدا شاعیر وشەکانی خۆی لە یەک کولتوور هەڵنابژێرێ و بەڵکوو لەو بەستێنە واقیعییە دەیان قۆزێتەوە و هەڵیان دەبژێرێ کە وشەکان لەوێدا پەروەردەکراون و لێواولێون لە باری مانایی و هەڵسەنگاندنەکان. بەم چەشنە، هەڵسەنگاندنە پێوەندیدارەکان بە واژەکەوە هەڵدەبژێردرێ، هەڵبەت لە ڕوانگەی بوونەوەرگەلێکی زیندووەوە کە هەڵگری ئەم هەڵسەنگاندنانەن. دەکرێ ئەوەش بوترێ کە شاعیر لەهەر ئانوساتێکدا بە پێی بێزاری یان خوازیاری و، هاوڕایی یان دژایەتی بیسەر هەڵسوکەوت دەکات. لەلایەکی ترەوە، هەڵسەنگاندن لە باری ئەوەشەوە کە پێوەندیی بە بابەتی گوزارەکەوە هەیە، واتە پاڵەوان، چالاکە. تەنانەت هەڵبژاردنی ئاوەڵناو یان خوازەش کردەوەیەکی هەڵسەنگێنەرانەیە لە دوو ڕووەوە، لەڕووی بیسەر و بێژەرەوە. بیسەر و پاڵەوان بە شێوەیەکی بەردەوام لە ڕووداوی داهێناندا کە بەردەوام بریتییە لە ڕووداوی پێوەندیی زیندووی نێوانیان بەشداریدەکەن.

ئەرکی بوتیقای کۆمەڵناسانە کاتێ دێتەگۆڕێ کە بتوانرێ هەرکام لە توخمەکانی شێوە لە پێگەی دەربڕینی بایەخدانانی دوولایەنەدا شی

بکرێتەوە: بایەخدانان لە لایەن بیسەرەوە و لە باری بابەتی گوزارەکەوە- واتە، پاڵەوان[٦]. بەڵام ئێستا بۆ چارەسەریی ئەم پرسە، زانیاریی کەممان لە بەردەستدایە و تەنیا دەکرێ لە پێناو ئاراستەکردنی قۆناغە سەرەتاییەکاندا هەوڵ بۆ ئەم توێژینەوەیە بدرێ.

جوانیناسیی شێوەخوازانەی هاوچەرخ، شێوەی هونەری وەک شێوەی کەرەستەکان پێناسە دەکات. پەرەپێدانی بەردەوامی ئەم روانگەیە دەبێتە هۆی پشتگوێ خستنی ناوەڕۆک، چونکە لە بەرهەمی هونەریدا چیدی جێگەیەکی ئەوتۆی بۆ نامێنێتەوەو، لە باشترین دۆخی خۆیدا شتێ نییە جگە لە کەرەستەیەک لە کەرەستەکانیتر، کەواتە، شێوەی هونەری کە پێوەندیی راستەوخۆی بە کەرەستەکانەوە هەیە، بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بیچمی دەداتێ.[٧]

لە ئاوەها روانینێکدا، شێوە سروشتی بایەخدارانە و چالاکی خۆی دەدۆڕێنێ و لەو کەسەیدا کە وەریدەگرێ، جگە لە هەندێ کاریگەرێتی خۆش و تەواو هەڵپەسێردراو، شتێکی دیکە هەڵناخرێنێ. هەڵبەت شێوە بە یارمەتیی کەرەستەکانەوەیە کە دێتەدیو لەواندا مسۆگەر دەبێ. بەڵام ماناکەی لە کەرەستەکان تێدەپەڕێ. **ماناو واتای شێوە بۆ ناوەڕۆک دەگەڕێتەوە نەک بۆ کەرەستەکان.** کەواتە دەکرێ بوترێ شێوەی پەیکەرەیەک لەراستیدا بیچمی بەردی مەڕمەڕ نییە و، بەڵکو برێتییە لە بیچمی جەستەی مرۆڤ. سەرەڕای ئەوەش، شێوە

٦. لێرەدا بەسەر پرسەکانی تەکنیکی شێوەدا باز دەدەین و لە لاپەڕەکانی دواییدا باسیان لێ دەکەین.

٧. ئەمە ڕوانگەی ڤ.م. ژیرمونسکییە.



مرۆڤی نیگارکێشراو "دەگۆڕێ" و "دەیکا بە پاڵەوان"و، یان "خۆشەویست"و یان "ناحەز"ی پیشاندەدا (بڕوانە بۆ شێوازی کاریکاتۆر لە پەیکەرتاشیدا). واتە، سەبارەت بەوەی کە وێنەکەی کێشراوە دەست دەکاتە دەربڕینی جۆرێ بایەخدانان.

ئەم واتایەی بایەخی شێوە، لە شیعردا لەهەر شوێنێکیتر ئاشکراترە. کێش و هۆکارە شێوەییەکانی دیکە، پێوەندییەکی چالاکانە لەگەڵ ئەوەی وێناکراوە دەبەستن، واتە پێوەندی لەگەڵ ئەوە دەبەستن کە شێوە بە چەشنێ ستالینی سەر کۆنەی دەکات و یان گاڵتەی پێدەکات.

جوانیناسیی دەروونناسانە روو لە "لایەنی کاریگەری سڕینەوە" دەکات، بەڵام بۆ ئێمە خاڵی گرنگ لێرەدا لایەنی دەروونناسانەی بابەتەکە و ناسینی وزە دەروونییە پوەندیدارەکان بە داهێنانەوە نییە و، گرنگی نادەینە وەرگرتنی داهێنەرانەو هاوبەشی شێوەی بەرهەم. خاڵی هەرە گرنگ بۆ ئێمە برێتییە لە مانای ئەم کاریگەرێتیانە و تایبەتمەندیی بگۆڕو ناوەرۆکخوازیان چونکە ئافرێنەر بە یارمەتی شێوەی هونەری لە هەمبەر ناوەڕۆکدا چالاکانە هەڵوێستی خۆی دیاریدەکا.

شێوە خۆی لە خۆیدا نابێ یەکسەر دڵنشینو دڵگیر بێ چونکە لەم بابەتەوە روونکردنەوەی چێژخوازانە کاریگەر نابێ. شێوە دەبێ جۆرێ بایەخدانانی راستکەرەوەی ناوەڕۆک بێ. بۆ نموونە، شێوەی دوژمن لەوانەیە بە تەواوی ناحەز بێ: بەڵام کاریگەرێتی باشی ئەو، واتە چێژی بینەر، بەرهەمی ئەوەیە کە ئەم شێوەیە، شیاوی دوژمن بێ و لەڕووی هونەری و تەکنیکیشەوە، بە یارمەتی کەرەستە بەکارهێنراوەکان و بە شێوەیەکی شارەزایانە و پسپۆڕانە سازکرابێ. شێوە پێویستە هەر لەم دوو لایەنەوە لێکبدرێتەوە: لەڕووی ناوەڕۆکەوە کە شێوە لێرەدا هەمان

بایەخدانانی ئایدیۆلۆژیکییە و، لەڕووی کەرەستەکانەوە کە ئەم بایەخدانانە لە باری هونەرییەوە بەهۆی ئەوانەوە دێتە بەرهەم.

بە هیچ جۆرێک پێویست ناکات کە ئەم بایەخدانانە ئایدیۆلۆژیکییە لە ڕواڵەتی شێوەدا دربڕدرێ و، بە چەشنی پەندو باو، هەڵسەنگاندنی ئەخلاقی، سیاسی و هتد لە ناوەڕۆکی بەرهەمدا دەرکەوێ. بایەخدانان دەبێ لە بزاوتی سوودبەخشی ئاوەڵناو و خوازە و لە ڕەوتی کامڵبوونی ڕووداوی وێناکراودا جێگەی بێتەوە و دەبێ جگە لە ڕێگەی سەرچاوە شێوەییەکانی کەرەستەکانەوە بیچم دەگرێ. بەڵام لە هەمانکاتدا، شێوە بەبێ ئەوەی بەناوەڕۆکدا تێپەڕێ نابێ پێوەندیی خۆی لەگەڵیدا بپچڕێ، ئەگینا دەگۆڕدرێ و دەبێ بە تاقیکارییەکی هونەری کە هەڵگری هیچ جۆرە مانایەکی هونەریی ڕاستەقینە نییە.

پێناسەی گشتیی شێواز لە ڕوانگەی تیۆریی ئەدەبیی کلاسیک و نێئۆکلاسیک و دابەشبوونی بنچینەیی شێواز بەسەر "شێوازی بەرز" و "شێوازی نزم"دا سروشتی بایەخدانەرانەو بزۆزی شێوەی هونەری بە تەواوی و سەر لەبەر دەسەلمێنێ. بنەمای شێوە لە ڕاستیدا زنجیرە قۆناغێکە و، لەم بارەشەوە لە پلەبەندییە سیاسی و دادوەرییەکان نزیک دەبێتەوە و، لە ناخی ئەو ناوەڕۆکەی شێوەی هونەری لەخۆگرتووە سیستەمێکی ئاڵۆز لە پێوەندیگەلی زنجیرە قۆناغە دوولایەنەکان دەخولقێنێ. هەر کام لەم توخمانە – بۆ نموونە، ئاوەڵناو یان خوازە– ئەو بابەتەی وەسفی دەکات دەی باتە تەشق، یان دای دەخات و ئاستەکەی دادەبەزێنێ. هەڵبژاردنی پاڵەوان یان ڕووداوێک، هەر لە سەرەتاوە، ئاستی گشتی شێوە و، تەنانەت ئاستی پەسەندکراوییەکەی لەگەڵ شێوازە جیاجیاکانی شێوەسازیدا دەستنیشان دەکات. ئەم پێداویستییە بنەڕەتییەش جۆرێکە لە یەکگرتن و، ئەم یەکگرتنە بایەخدانەرانەی



زنجیرە قۆناغەکانی شێوە و ناوەڕۆک دەبێ هەڵگری ئەم تایبەتمەندییە بێ. هەڵبژاردنی ناوەڕۆک و هەڵبژاردنی شێوە، بەرهەمی یەک کردەوەیە کە هەڵوێستی سەرەکی و بنگەهێنی ئافرێنەر نیشان دەدات و، لەو ڕێگەیەشەوە بایەخدانێکی کۆمەڵایەتیی یەکگرتوو دەردەبڕدرێ.

## (٦)

بەتەواوی ئاشکرایە کە شیکاریی کۆمەڵناسانە نایەتەگۆڕێ مەگەر ئەوەی کە لە بینای گوتەیی و زمانیی بەرهەمەکەوە دەست پێبکات. بەڵام هیچ کات نابێ وەکو بوتیقای زمانناسانە لە سنووری بینای گوتەیی بەرهەمدا زیندانی بکرێ. لەڕاستیدا، ڕوانینی هونەری بۆ بەرهەمی ئەدەبی، لە ڕەوتی خوێندنەوەدا، بە "نووسین"ەوە دەست پێدەکات (واتە، وێنەی دیاریکراوی واژەی نووسراو یان چاپکراو). بەڵام هەر لە قۆناغی پاش وەرگرتنی بەرهەمەکە بەدواوە، ئەم وێنە دیاریکراوو ئاشکرایە پەیتا پەیتا ڕوو لە نەمان دەکا و لە پشت لایەنەکانی دیکەی واژەکەوە– وەکو دەربڕین، وێنەی دەنگی، لەحنو مانا – بەتەواوی وندەبێو، ئەم لایەنانەش بەرەو لای ئەوپەڕی واژەکە هانمان دەدەن. کەواتە دەکرێ بوترێ کە پێوەندیی لایەنی تەواو زمانیی گوتار و گشتێتی بەرهەمی هونەری، وەکو پێوەندیی نووسین و واژەیە لە گشتێتییەکەیدا. لە شیعریشدا، گوتار "سیناریۆ"ی ڕووداوەکەیە و وەرگرتنی هونەریی شیاو بەم بۆنەیەوە دەهێنرێتە سەر سەکۆی شانۆ کە لە واژە و لە شێوەگەلی ڕێکخستنی واژەدا،

پێوەندییە دوولایەنە زیندوو و تایبەتییەکانی نووسەر و ئەو جیهانەی ئاراستەی کردووە، بە وردی لێکی داوەتەوە و لە پێگەی بەشداربووی سێهەمدا – واتە بیسەر– دێتە نێو ئەم پێوەندییە دوولایەنانەوە. لە شوێنێکیشدا کە شیکاریی زمانناسانە شتێ نابینێ جگە لە واژە و پێوەندیگەلی دوولایەنەی نێوان توخمە دەرهەستەکانیان (توخمە دەنگی، دەنگناسانە و رێزمانی و نەحوییەکان)، پێوەندیی نێوان مرۆڤەکان بۆ وەرگرتنی هونەریی زیندوو و بۆ شیکاریی کۆمەڵناسانەی بەرهەست دادەبەزێندرێ، واتە، هەر تەنیا ئەو پێوەندییانە زەق دەبنەوە کە لە کەرەستە گوتەییەکاندا نوێندراون و مسۆگەر بوونە. گوتار کۆئەندامێکە کە جگە لە سۆنگەی وەرگرتنی داهێنەرانەوە، قەت لەرێگەی پێوەندیی کۆمەڵایەتی زیندووەوە گۆشت و پێست ناگرێتە خۆی.

ئێستا هەوڵدەدەین بەکورتی دەست بکەین بە توێکاریی سەرەتایی سێ لایەنی سەرەکیی پێوەندییە دوولایەنەکانی بەشداربووان لە رووداوێکی هونەریدا. ئەمەش ئەو پێوەندییانەن کە بە گشتی تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی شێوازی شاعیرانە لە پێگەی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیدا دابیندەکەن. بەڵگە نەویستە کە لێکدانەوەی بەربلاوتری ئەم لایەنانە لە سنووری بەر تەسکی ئەم وتارەدا ئەنجام نادرێ.

ئێمە نووسەر، پاڵەوان و بیسەر لە دەرەوەی رووداوی هونەریدا لە بەرچاو ناگرین و، بەڵکو وەکو بەشداربووانی چالاک لە وەرگرتنی بەرهەمی هونەری و لایەنە پێکهێنەرە پێویستەکانی ئەم بەرهەمە لەقەڵەمیان دەدەین. هەر هەمووشیان سەر لەبەر وزەگەلێکی زیندوون کە شێواز و شێوە دیاری و دابیندەکەن. لێرەدا، کۆی ئەو بابەتمەندییەی کە مێژوونووسی ئەدەب و کۆمەڵگا دەتوانێ دەربارەی



نووسەر و کەسایەتییەکانی بەرهەمی ئەدەبی گردوگۆیان بکاتەوە (وەک ژیاننامەی نووسەر، وەسفی کاتناسانە و کۆمەڵناسانەی وردی کەسەکان و... ) رەچاو نەکراوە. ئەم بابەتمەندییە بە شێوەی راستەوخۆ ناچێتە نێو بنەمای بەرهەمەکەوە و لە دەرەوەیدا جێگیر دەبێ؛ بیسەریش تەنیا لەو رووەوە بۆمان گرنگە کە بۆ خۆی کەوتۆتە بەر سەرنجی نووسەرەوەو، بەرهەم بەرەچاوکردنی ئەوەوە نووسراوە. لە ئەنجامدا، گرنگایەتی بیسەر لەوەدایە کە لە دابینکردنی بنەمای بەرهەمدا لە ناوەوەڕا دەوری هەیە. کەواتە، مەبەستی ئێمە خوێنەرە راستەقینەکان نییەو، جەماوەری خوێنەرە زەینییەکانی نووسەر کۆی خوێنەرە راستەقینەکان پێک ناهێنن.

یەکەمین لایەنی ناوەڕۆک کە هاوکات شێوەش دابیندەکات برێتییە لە پلە و پایەی بایەخدارانەی رووداوی وێناکراو و هەڵگرەکەی (واتە پاڵەوان، چ ناوی لێ برابێ و چ ئاماژەی بۆ نەکرابێ). هەڵبەت ئەمەش بە سەرنجدان بە یەکگرتوویی و تێکەڵاویی نزیکی پلە و پایەی ئافرێنەرو وەرگر رەچاودەکرێ. لێرەشدا رێوڕاست وەک ژیانی سیاسی یان دادوەرانە رووبەڕووی پێوەندییەکی دوو رەهەندی دەبینەوە: ئاغا و کۆیلە، خاوەن موڵک و شوان، هاوڕێی پیاوو هاوڕێی ژن و هتد.

کەواتە خەملاندنی سەرەکیی شێواز لە هەنگاوی یەکەمدا لە رێگەی ئەو کەسەوە کە قسەی لێدەکرێ و پاشان لە رێگەی ئاستی پێوەندیی ئەم کەسە لەگەڵ بێژەردا دابیندەکرێ (لەوانەیە پاڵەوانی بەرهەمەکە لە زنجیرە قۆناغە کۆمەڵایەتییەکاندا بەرزتر، هاوڕادە و یان خوارتر لە بێژەر بێ). کاتێ پاشا، باوک، برا، کۆیلە و یاخود هاوڕێ، لە رواڵەتی پاڵەوانی گوزارەدا دەردەکەون، بنەما شێوەییەکەش دیاریدەکەن.

گرنگایەتی زنجیرە قۆناغی تایبەتی پاڵەوانەکەش ئەو بەستێنە سەرەکییە دەرنەبڕاوە دابینیدەکا کە گوزارەی شاعیرانە تێیدا جێگیر بووە.

هەر بەهەمان شێوەش کە لەو نموونەیەی دەربارەی ژیانی رۆژانە هێنامانەوە، "خوازەی لەحن" پێوەندییەکی زیندووی لەگەڵ بابەتی گوزارەکەدا هەبوو و، سەرجەمی توخمەکانی شێوازی بەرهەمی شاعیرانەش لێواولێون لە پێوەندیی هەڵسەنگێنەرانەی نووسەر لەگەڵ ناوەڕۆکدا کە تێکرا روانگەی کۆمەڵایەتی و بنچینەیی نووسەر دەردەبڕن. جارێکی تریش پەنجە دەخەینە سەر ئەو خاڵە کە مەبەستمان ئەو هەڵسەنگاندنە ئایدیۆلۆژیکانە نییە کە وەکو داوەری یان ئەنجامگیریی نووسر چوونەتە نێو ناوەڕۆکی بەرهەمەکەوە، بەڵکو ئەوەی مەبەستمانە هەڵسەنگاندن لەرێگەی شێوەوەیە کە لەلایەکەوە بنەڕەتیتر و قووڵترەو، لەلایەکی دیکەشەوە، دەربڕینی خۆی لە چۆنیەتی هەڵبژاردن و بەرودوایی رێکخستنی کەرەستە هونەرییەکاندا دەدۆزێتەوە.

هەندێ لە زمانەکان، بەتایبەت زمانی ژاپۆنی، جبەخانەیەکی پڕاوپڕو جیاجیان لە شێوەگەلی وشەیی و رێزمانیی تایبەت لەبەردەستدایە کە بەکارهێنانیان بەندە بەجێگەو پێگەی پاڵەوانی گوزارەکەوە (وەک رەوشتو ئاکارو رێورەسمی خواناسانە).[8]

دەکرێ بوترێ کە ئەوەی بۆ ژاپۆنییەکان هێشتا پرسیارێکی رێزمانییە بۆ ئێمە زیاتر پرسێکی شێوازییە. هۆکارە پێکهێنەرە سەرەکییەکانی شێوازی حەماسەی پاڵەوانی و تراژیدی و غەزەل و

8. W. Von Humboldt, Kiawi Werk II, *Le Manuel de Japonais*. Hoffiman, Japa- Sprachehr. 59-75.



ئەوانیتر بەتەواوی بەندن بەپێگەی زنجیرە قۆناغی بابەتی گوزارەکەوە (پاڵەوان) لەهەمبەر بێژەردا.

نابێ وا بزانین ئەدەبی هاوچەرخ ئەم بابەتمەندییەی زنجیرە قۆناغی دوو لایەنەی نێوان ئافرێنەر و پاڵەوانی وەلاناوە. بەپێچەوانەوە، ئەم بابەتمەندییە ئاڵۆزتر بۆتەوە و زنجیرە قۆناغە کۆمەڵایەتی و سیاسییە هاوچەرخەکانی خۆی، بەو چەشنەی کە بۆ نموونەی کلاسیسیزم پیشانی دەدا، نانوێنێتەوە.

بەڵام، بنەواشەی گۆڕانکاریی شێواز لەسەر بناغەی گۆڕانکاریی بایەخە کۆمەڵایەتییەکانی پاڵەوانی گوزارە، بەتەواوی و بەبێ سێ‌ودوو بایەخ و گرنگایەتی خۆی پاراستووە: شاعیر (لە شیعرەکەی خۆیدا) لە دوژمنی خۆی بێزار نییە و لە رێگەی شێوەی بەرهەمەکەیەوە دەست ناکاتە پیا هەڵگوتن و خۆشگەرەکبوونی هاوڕێی خۆی و، لە رووداوەکانی ژیانی کەسەکیی خۆی نە شادمانە و، نەک خەمگین. لە ساتەوەختێکیشدا کە شاعیر بۆ بەشێکی گەورەی سەرچاوەی سروش و ئیلهامی خۆی سوود لە رووداوەکانی ژیانی کەسایەتی خۆی وەردەگرێ، دەبێ سەرچاوەی ئەم سروشە پەرەپێبدا و، هەمەکی بکاتەوە و لە ئاکامدا "کۆمەڵایەتی"ی بکاتەوە، واتە هێندە قووڵایی ببەخشێتە رووداوی ناوبراو کە ماناو گرنگایەتییەکی کۆمەڵایەتی بداتێ.

دووهەمین لایەنی پێوەندییە دوولایەنەکانی پاڵەوان و ئافرێنەر کە شێوازی بەرهەمەکە دابیندەکات، بریتییە لەرادەی نزیکایەتی هەبووی نێوانیان. ئەم لایەنە لە هەموو زمانەکاندا خاوەن دەربڕینێکی رێزمانیی بێنێوەنجە: بەکارهێنانی یەکەم کەس، دووهەم کەس یان سێهەم کەس و گۆڕانکاریی بنەمای رستە لەسەر بناغەی بکەرەکەی (من، تۆ، ئەو).

ئەو شێوەیەی کە داوەریکردن دەربارەی کەسی سێهەم دەیگرێتە خۆ و، ئەو شێوەیەی کە لەکاتی وتووێژدا لەگەڵ ئەویدیدا بەکاردەبرێ و،لە ئاکامدا، ئەو شێوەیەی بۆ قسەکردن لەسەر خود رواڵەتێکی باوی هەیە(هەروەهاش چشتە جیاجیاکانی هەرکام لەمانە)، هەموویان تێکڕا لە باری رێزمانییەوە دیاریکراو و جیاوازن. بەم چەشنە، بنەمای زمان بۆ خۆی لێرەدا پێوەندیی دوولایەنەی وتووێژکەرەکان دەنوێنێتەوە.

لە هەندێ زماندا شێوە رێزمانییەکان دەتوانن چەشنە جیاجیاکانی ئەو پێوەندییە کۆمەڵایەتی و دوولایەنەی کە وتووێژکەرەکان پێکەوە گرێدەدەن پیشانبدەن و هەروەها رادەی جیاوازی نزیکایەتییان لە یەکتر بە باشی بخەنەڕوو. لەم روانگەیەوە، شێوەکانی کۆ لە چەند زمانێکدا زۆر سەرنجراکێشن. بۆ نموونە، هەکرێ ئاماژە بۆ شێوەی ناسراو بە "دەرهەست" و "بەرتەسک" بکەین کە کاتێ بێژەر بە بەکارهێنانی جێناوی "ئێمە"وە بیسەریشی بەلاوە مەبەستەو، بە بکەری ناوبژیوو هەڵسەنگێنەری دادەنێ، شێوەیەکی تایبەت بەکاردەهێنێ. لەلایەکی ترەوە، کاتێ خۆی و ئەویدی بەلاوە مەبەستە ("ئێمە" بەمانای "ئەو و من")، شێوەیەکی تر بەکاردەهێنێ، وەک بەکارهێنانی لایەنی دوانەیی لە هەندێ زمانی ئوستراڵیاییدا. هەر بەم چەشنەش، دوو شێوەی جیاواز بۆ دەربڕینی بکەری سێ کەسی لە ئارادا نییە: یەکێکیان بە مانای "من وتۆو ئەو"و، ئەویدیکە بە مانای "من و ئەو و ئەو". (٩)

٩. بروانە بۆ Matthens, *Aboriginal Languages of Victoria*. هەروەهاش بڕوانە بۆ پێشەکی هەمبرلێت.



لە زمانە ئەورووپییەکاندا ئەم جۆرە پێوەندییە دوولایەنەی نێوان وتووێژکەران خۆی لە رواڵەتی دەربڕینێکی رێزمانیی تایبەتدا نابینێتەوە. ئەم زمانانە سروشتێکی دەرهەستتریان هەیەو ناتوانن بەیەک ئەندازە بارودۆخی گوزارە لە رێگەی بنەمای رێزمانیی خۆیانەوە بنوێننەوە. لە هەمبەر ئەمەشدا، ئەم پێوەندییە دوولایەنانە دەربڕینەکەی خۆیان-بە شێوەیەکی زۆر ناسکتر و جیاوازتر-لە شێوازو لەحنی گوزارەکە دەبیننەوە: بارودۆخی کۆمەڵایەتی ئافراندن بەسەرجەم لایەنەکانیەوە لە رێگەی شێوازە تەواو هونەرییەکانەوە لە بەرهەمەکەدا دەنوێندرێتەوە.

کەواتە، شێوەی بەرهەمی شاعیرانە تاڕادەیەکی زۆر سەر بە شێوەیەکە کە نووسەر پاڵەوانەکەی خۆی هەست پێدەکات، ئەو پاڵەوانەی کە هاوکات ناوەندی بیچمگیریی گوزارەکەشە. شێوەی گێڕانەوەی بابەتیانە، شێوەگەلی بانگکردن (خواهیشت، نزاو سکاڵا، هەندێ شێوەی شیعریی لیریک)، شێوەی دەربڕینی بارودۆخ (دانپیانان، سەربوردە، دەربڕینی ئەشق، کە یەکێکە لە شێوە هەرە گرنگەکانی شیعری ئاشقانە)، سەرومڕ پێکەوە سەر بە پلەی نزیکایەتیی نێوان نووسەر و پاڵەوانن. ئەو دوو لایەنەی ئاماژەیان بۆ کرا – واتە بایەخی زنجیرە قۆناغداری پاڵەوان لەلایەکەوە و پلەی نزیکایەتی وی لەگەڵ نووسەردا لەلایەکی ترەوە – ئەگەر بە شێوەیەکی جیاش رەچاو بکرێن، هێشتا هەر بۆ دابینکردنی شێوەی هونەری ناتەواو و ناتوانان.

بەشداربوویەکی سێیەمیش – بیسەر – بەردەوام لە ئارادایە و گۆڕانکاری بەسەر پێوەندییە دوولایەنەکانی ئەو دوو بەشداربووەکەی تریشدا (ئافرێنەر و پاڵەوان) دەهێنێ.

لە راستیدا، پێوەندییە دوولایەنەکانی نووسەر و پاڵەوان هیچ کات یەکسەر تایبەت و دووکەسی نین: شێوەی هونەری بەردەوام بەشداربووی سێیەمیش - بیسەر - لە بەرچاو دەگرێ و، ئەوەش ئەو بەشداربووەیە کە کاریگەرێتی حاشا هەڵنەگر لەسەر کۆی لایەنەکانی بەرهەمەکە بەجێ دەهێڵێ.

بیسەر بە چ ئاراستەیەکدا دەتوانێ شێوازی گوزارەی شاعیرانە تێپەڕێنێ؟ لێرەشدا پێویستە دوو لایەنی سەرەکی لێکدی جیا بکەینەوە: سەرەتا نزیکایەتی هەبوو لە نێوان بیسەرو نووسەردا و، پاشان پێوەندیی بیسەر و پاڵەوان. بۆ جوانیناسی، هیچ شتێ زیانهێنەرتر لە سەرنجنەدان بە دەوری سەربەخۆیی بیسەر نییە. بڕوایەک لەگۆڕێدایە پێی وایە کە بیسەر دەبێ- لانی کەم لە باری تەکنیکی بەرهەمەکەوە - بە هاوتای نووسەر دابنرێ و هەڵوێستی بیسەری شیاو هەر تەنیا پێویستە لە پێگەی ئافراندنەوەی هەڵوێستی نووسەردابێ. بەڵام لە راستیدا، دۆخەکە لێرە بە تەواوی جیاوازەو، لەوانەشە باشتر وابێ کە پرسەکە بەراوەژوو بکەینەوە: بیسەر هیچکات هاوتای نووسەر نییە. ئەو لە رووداوی داهێنانی هونەردا خاوەن جێگەو پێگەی خۆیەتی، جێگەو پێگەیەکی تایبەت بەخۆی. ئەو دەبێ هەڵوێستێکی تایبەت بۆ خۆی تەرخان بکات و هاوکات بەهەر دوو ئاراستەکەشدا تێپەڕێ بەرەو لای نووسەر و روو بە پاڵەوان. هەر ئەم هەڵوێستەیە کە شێوازی گوزارەکە دابیندەکات.

نووسەر بە چ شێوەیەک بیسەرەکەی خۆی "هەست پێدەکات"؟ لە پێداچوونەوەی ئەو نموونەیەی لە گوزارەی رۆژانەدا هێنامانەوە، ئەوەمان دیت کە تەبایی یان دژایەتی گریمانەکراوی بیسەر تا چ رادەیەک لەحنی گوزارەکە دابیندەکات. ئەم مەرجە لەمەڕ سەرجەم



لایەنەکانی شێوەشەوە هەر دیسانەوە راستە. بەواتایەکی مەجازی، دەکرێ بوترێ بیسەر بەگشتی وەکو هاوپەیمانی نووسەر لە پاڵ ئەودا جێگیر دەبێ. هەڵبەت ئەم هەلومەرجە نەریتییە هەموو کاتێک نایەتە کایەوە.

هەندێ جار بیسەر لە پاڵەوانی گوزارەکە نزیک دەبێتەوە. نموونەی هەرە ئاشکرا و ئاسایی ئەم بابەتە لە شێوازی مشتومڕدا دەدۆزرێتەوە کە پاڵەوان و بیسەر لە یەک ئاستدا دادەنێ. هەجویش لەوانەیە بیسەرەکە بگرێتەوەو، لە پاڵەوانی هەجوکراو نزیکی بکاتەوەو نەک لە نووسەری هەجوداهێن: ئەم خاڵە یەکێ لە جۆرە دەرهەستەکانی گاڵتەیەو، لەوەی کە تێیدا بیسەر حەزلە پێکەنینی نووسەر ئەکا بە تەواوی جیاوازە. لە رۆمانتیزمدا، دیاردەیەکی سەرنجڕاکێش ئەبیندرێ: لەم قوتابخانەیەدا، ئەلێی زۆربەی کات نووسەر دژی بیسەر لەگەڵ پاڵەواندا پەیمان ئەبەستێ (بڕوانە بۆ ڕۆمانی *لوسیندە* بەرهەمی فردریش ڤۆن شلێگل و، لە بابەت ئەدەبی رووسیشەوە تا رادەیەک بۆ پاڵەوانی بەرهەمەکەی لێرمانتۆڤ).

تێگەیشتنی نووسەر لە بیسەر لە هەندێ شێوەدا وەک دانپیانان و سەربوردە زۆر زۆر سەرنجڕاکێشە. سەرلەبەری چەشنەکانی هەست- لە رێزگرتن و خۆبەکەمدانان لە بەرامبەر بیسەرێکدا کە وەکو ناوبژیو دانراوە تا دەگاتە بەدگومانییەکی سووک و یان دوژمنایەتی — ئەتوانن شێوازی دانپیانان و سەربوردە دابینبکەن. بۆ روونتر کردنەوەی ئەم بابەتە، هەندێ کەرەستەی زۆر زیندووو رەسەن لە بەرهەمەکانی داستایۆڤسکیدا هەست پێدەکرێ. شێوازی "دانپیانان" ی هیپۆلیت لە گەمژەدا تا رادەیەک بەندە بە بەدگومانییەکی سووک و دوژمنایەتی لە هەمبەر سەرجەم ئەو کەسانەی رازورمزەکانی

پیاوێکی سەرەمەرگ ئەبیستن. تیشکێکی وا یەکسان، بەڵام تۆزێ کەمڕەنگتر، شێوازی *یادداشتە ژێرزەمینییەکان* ڕووندەکاتەوە.

بە پێچەوانەوە شێوازی"دانپیانان" ی ستاوروگین لە *نفرینکراوەکان*دا پتر پیشاندەری دڵنیایی لە بیسەر و ناساندنی مافەکانیەتی، هەرچەندە ئەم بابەتە هەستێکی مەیلەڕق لێرەو لەوێ هەڵئەخڕێنیو ئەبێتە هۆی دابڕانی شێواز لە ئاکار(Jurodstvo). "نەستەقبێژی" لە پێگەی شێوەی تایبەتی گوزارەدا – کە لە سنووری ئاقاری هونەردا جێگیر دەبێ – بەر لە هەرشتێ- بەندە بە ململانێیەکی زۆر بێ سنوور و ئاڵۆز و پێچاوپێچ لە نێوان بێژەر و بیسەردا.

شێوەی شیعر سەبارەت بە پێگەی بیسەر خاوەن هەستیارییەکی زۆرە. مەرجی سەرەکیی لەحنی لیریک، دڵنیایی تەواوە لە هاودڵیی بیسەرانە. هەرکە شک و گومان چووە ناو هەلومەرجی لیریکەوە، شێوازی شیعرەکە لە پڕێکدا دەگۆڕدرێ. ڕوونترین دەرکەوتەی ئەم ململانێیە لەگەڵ بیسەردا لە "تەنزی لیریکی"دا دەدۆزرێتەوە (هاینریش هاینەو، لە شیعری مۆدێرندا، لافۆرگ، ئانتسکی و چەند کەسێکی تر). وێڕای ئەمانەش شێوەی تەنز لەگەڵ ململانێی کۆمەڵایەتیدا بەپێی هەندێ مەرج سەردەگرێ وەک یەکانگیریی ئەم دوو هەڵسەنگاندنە دیاریکراوە لەدەنگێکی یەکبووداو، یان دەستێوەردان و، کێشەیەک کە لە نێوانیاندا ڕوودەدات.

جوانیناسیی هاوچەرخ، تیۆرییەکی نوێی لەسەر تراژیدی ئاراستە کردووە، تیۆرییەک کە بە ژێرناوی "یاسایی"یەوە دەکرێ دابەزێندرێ بۆ هەوڵدان بە مەبەستی تێگەیشتن لە بنەمای تراژیدی لە پێگەی بنەمای دادگاییکردنێک لە بەرامبەر دادگادا.



پێوەندییە دوولایەنەکانی پاڵەوان و گرووپی هاوبێژان لەلایەکەوەو، پێگەی هەمەکیی بیسەر لە لایەکی ترەوە، تارادەیەک هەڵگری ڕاڤەیەکی یاساییین. هەڵبەت لێرەدا ناکرێ جگە لە بەراوردکاری باس بکرێ. خاڵی هاوبەشی تراژیدی و هەر بەرهەمێکی ئەدەبیی دیکە لەگەڵ دادگاییکردندا، لە بنەڕەتدا و بەڕاستی، هەر تەنیا لە ئامادەبوونی "لایەنەکانی ململانێ"دایە، واتە بەشداربووانێک کە هەڵوێستی جیاوازیان هەیە.

نازناوە زۆر کلێشەییەکانی شاعیر، وەک نازناوی "داوەر"، "شاهید"، "بەرگر"و تەنانەت "جەلاد" (بگەڕێینەوە بۆ کێشەی **هەجوی تاڵ** – ژوڤێنال، باربیە، تیکراسۆڤ و دیتران) هەروەهاش هەندێ نازناوی دیکەی پاڵەوان و بیسەر، هەر ئەم بنیاتە کۆمەڵایەتییەی شیعر لە ڕواڵەتی وێکچوویدا پیشاندەدەن. بەهەرحاڵ، نووسەر، پاڵەوان و بیسەر هیچکات لە یەکیەتی بێ جیاوازیدا ئاوێتەی یەکدی نابن، بەڵکو پێگە سەربەخۆکان داگیر دەکەن.

ئەوان بەڕاستی نەک "لایەنەکان"ی دادگاییکردن نین، بەڵکو "لایەنەکان"ی ڕووداوێکی هونەرین کە خاوەن بنەمایەکی کۆمەڵایەتی تایبەتن و "کۆنووس"ەکەی بە وردی بڕێتییە لە بەرهەمی هونەری.

لێرەدا پێویستە جارێکی تر ئەو خاڵە دەستنیشان بکەین کە ئەو بیسەرەی بەلای ئێمەوە مەبەستە، بەشداربووی ناوەکیی ڕووداوێکی هونەرییە و شێوەی بەرهەمی هونەری لەناوەوەڕا دابیندەکات. ئەم بیسەرە- ڕێوڕاست وەک نووسەر و پاڵەوان – یەکێ لە توخمە ناوەکی و پێویستەکانی بەرهەمەو، بەهیچ جۆرێک لەگەڵ "جەماوەری خوێنەران"ی ئاسایی دەرەوەی بەرهەمدا یەکێک نییەو، هەرچەندەش لەوانەیە خواستە هونەریو سەلیقەییەکانی ئەوان بە شێوەیەکی

هۆشیارانە ڕەچاوکرابێ. ئەم چەشنە ڕەچاوکردنە هۆشیارانەیە، ناتوانێ شێوەی هونەری لە ڕەوتی ئافراندنی زیندووی خۆیدا بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ و قووڵ دابینبکات. سەرەڕای ئەمەش، ئەگەر ئەم هەڵوێست گرتنە هۆشیارانەیەی خوێنەران دەورێکی نەک زۆر گرنگیش لە بەرهەمی شاعیردا بگێڕن، ئەوا بەرهەمەکە بەناچار ڕەسەنایەتی خۆی دەدۆڕێنێ و دادەبەزێتە سەر ئاستێکی کۆمەڵایەتی نزمتر.

ئەم ڕەچاوکردنە دەرەکییە بەم مانایەیە کە شاعیر بیسەرە ناوەکییەکەی خۆی دۆڕاندووەو، لە گشتێتی کۆمەڵایەتی جیابۆتەوە، ئەو گشتێتییەی دەیتوانی هەڵسەنگاندنەکان و شێوەی هونەریی گوزارە شاعیرانەکانی ئەو شێوەیە دابینبکات کە شتێ نییە جگە لە دەربڕینی ئەم هەڵسەنگاندنە کۆمەڵایەتییە سەرەکییانە (لە ناوەوەڕاو جیاو بە دوور لەهەر جۆرە ئاوڕێکی دەرهەستانە). شاعیر هەرچی پتر لەو یەکە کۆمەڵایەتییەی تێدایە و دڵبەستەیەتی جیابێتەوە، هۆگرییەکەی بەرەو لای ڕەچاوکردنی خواستە دەرەکییەکانی هەندێ خوێنەری دیاریکراو زێدەتە ڕوو لە زیادبوون دەکات. هەر تەنیا تاقمێکی کۆمەڵایەتی نامۆو دوور لە شاعیر دەتوانێ داهێنانەکەی لە دەرەوەڕا دابینبکات. تاقمی کۆمەڵایەتی خودی شاعیر پێویستی بە بابەتمەندییەکی وا دەرەکی نییە: ئەم تاقمە لە دەنگی خودی شاعیردا، لە خەملاندنی سەرەکیی ویدا، لە لەحنەکانی گوتەو قسەکردنندا ئامادەبوونی هەیە- جیا لەمەی کە شاعیر بیەوێ یان نەیەوێ.

شاعیر لەسەرجەم تەمەنی ژیانی خۆیدا، لە ڕەوتی کردارو پەرچەکرداری گشتگیر لەگەڵ ژینگەی خۆیدا، واژەکان وەردەگرێ و شێوەی بەخشینی لەحن بەو واژانە فێر دەبێ. سەرەتا کاربردی ئەم



واژە و لەحنانە لە گوتاری ناوەکیی خۆیەوە دەست پێدەکا، کە لەم ڕێگەیەوە دەست دەکرێ بە ئەندێشەداڕشتن و گەیشتن بە خودئاگایی. ئەمە گومانێکی گەمژانەیە کە کەسێ دەتوانێ گوتارێکی دەرەکی دژی گوتاری ناوەکیی تایبەت و، پێچەوانەی شێوەی زانیاری وەرگرتنی گوتەیی وی لە خود و جیهان، بە هی خۆی بزانێ. هەرچەندە ئافراندنی وەها گوتارێک بۆ دابینکردنی پێداویستیی هەندێ بارودۆخی دیاریکراوی ژیان دەتوانرێ سەربگرێ، بەڵام گومان لەوەدا نییە کە ئەگەر لە سەرجەم سەرچاوەکانی خۆی جیابێتەوە، هەرچەشنە ڕێکوپێکی و تەکووزییەکی هونەریی لە دەستدەدا. شێوازی شاعیر لە شێوازی گوتاری ناوەکیی ئەوەوە لە دایکدەبێ، شێوازێک کە لەهەر جۆرە چاودێرییەک هەڵدێ و بەرهەمی سەرجەم ژیانی کۆمەڵایەتی شاعیرە.

**شێواز، واتە مرۆڤ:** بەڵام دەکرێ بوترێ تاقمێکی کۆمەڵایەتی کە لە ڕێگەی بیسەرێکەوە دەردەکەوێ بە شێوەیەکی بەردەوام لە گوتاری ناوەکی و دەرەکیی ئەم مرۆڤەدا بەشداریدەکا و، لە ڕاستیدا شێواز وێنا و کاریگەرێتی و دەسەڵاتی تاقمی کۆمەڵایەتییە.

ناوەکی ڕاستییەکە ئەوەیە کە هەر کردارێکی زانیاری- تەنانەت ئەگەرنتۆزێ جیاوازیش بێ- ناتوانێ بە بێ گوتارو واژەکان و لەحنەکان - واتە هەڵسەنگاندنەکان- هەڵبکا و، کەواتە، بۆ خۆی کردارێکی کۆمەڵایەتی و کردارێکی پێوەندیدارانەیە. تایبەتیترین تێرامانیش هەولێکە بۆ وەرگێڕانی خود بۆ زمانێکی هاوبەش و وەدەستهێنانی گرنگایەتی لە ڕوانگەی **دیتران**-ەوە؛ لە ئەنجامدا، هەر ئەمە جۆرێ لایەنگری و هۆگریی بیسەرێکی بەزەبر دەگرێتەخۆ. ئەم بیسەرە لەوانەیە هەر تەنیا هەڵگری هەڵسەنگاندنەکانی تاقمێکی

کۆمەڵایەتی بێ کە بکەری تێرامان هی ئەوە. لەم رووەوە، زانیاری ئەگەر ناوەڕۆکەکەی پشتگوێ بخرێ، ئیدی دیاردەیەکی تەنیا دەروونناسانە نییە، بەڵکو بەر لەهەر شتێ دیاردەیەکی ئایدیۆلۆژیکی و ئافرێنراوی رەوتی پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە. ئەم هاوبەشە بەردەوامەی سەرجەم کردارەکانی زانیاریی ئێمە هەر تەنیا ناوەڕۆکی زانیارییەکە دابین ناکات، بەڵکو هەڵبژاردنی خودی ئەو ناوەڕۆکەش دەستەبەردەکات. ئەم بابەتەش بۆ ئێمە بەخاڵێکی سەرەکی دەژمێردرێ. ئەو بیسەرەی شێوەی هونەری دابیندەکات، دێرین نموونەکەی خۆی ڕێوڕاست هەر لە هاوبەشە بەردەوامەکەی سەرجەم کردارەکانی ئاگایی ئێمەدا دەدۆزێتەوە.

هیچ شتێ زیانهێنەرتر لەوە نییە کە بنەمای ناسکو کۆمەڵایەتی ئافراندنی گوتەیی وەک کاروباری کاسبکارانە و دزێوی بڵاوکەرەوەیەکی بۆرژوا کە "تەنیا بارودۆخی بازاڕی کتێبی بەلاوە گرنگە" لە قەڵەم بدەین و هەندێ وتەزا وەک "خواستەو دەرخستە" لە لێکۆڵینەوەو پێداچوونەوەی بنەمای ناوەکیی بەرهەمدا بەکاربهێنن. بەداخەوە زۆرن ئەو "کۆمەڵناسانە"ی کە دەوری شاعیر لە خزمەتکردنی کۆمەڵگادا لەگەڵ چالاکی بڵاوکەرەوەیەکی چالاکدا بەیەکێ دەزانن.

هەڵبەت لە بارودۆخی ئابووریی بۆرژواییدا، بازاڕی کتێب، بەرهەمی ئافرێنەرانەی شاعیر "رێکدەخات"، بەڵام ئەم بابەتە نابێ لە هیچ شوێنێکدا بە دەوری تەکووزی بەخشی بیسەر بشوبهێندرێ، بیسەرێک کە یەکێ لە توخمەکانی بنەمای هەمیشەیی داهێنانی هونەرییە. بۆ مێژوونووسی ئەدەب لەسەردەمی سەرمایەداریدا، بازاڕ هۆکارێکی زۆر گرنگە، بەڵام بۆ بوتیقای تیۆریک کە بە دوای لێکۆڵینەوەی



ئایدیۆلۆژیکی سەرەکیی هونەرە، ئەم هۆکارە دەرەکییە دەورێکی بەرچاوی نییە. جگە لەمەش، مێژوو ئەدەب نابێ مێژووی بازاڕی کتێب و مێژووی بڵاوکردنەوە لەگەڵ مێژووی شیعردا بەهەڵە بە یەکێ دابنێ. ئەو لایەنە جیاجیایانەی شێوەی گوزارەی هونەری دابیندەکەن برێتین لە:

١. بایەخی زنجیرە قۆناغداری پاڵەوان یان رووداوی چێکەری ناوەڕۆکی گوزارە
٢. پلەی نزیکایەتی پاڵەوان لەگەڵ نووسەردا
٣. بیسەر و پێوەندییە دوولایەنەکانی لەگەڵ نووسەر و پاڵەواندا

کۆی ئەم لایەنانە خاڵەکانی داسەپاندنی هێزە کۆمەڵایەتییە دەر-هونەرییەکان لەسەر شیعر پێکدێنن و، ڕێوڕاست لەبەر تیشکی ئەم بنەما لە بنەڕەتدا کۆمەڵایەتییەیە کە ئافراندنی هونەری لە هەموو لایەکەوە بەرەوڕووی کاریگەرێتییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی بەستێنە جیاوازەکانی ژیان ئاوەڵا دەکرێتەوە. پێچەوانەی ئەم بابەتەش هەر ڕاستە: لەوانەیە کردارو پەرچەکرداری هونەریی ئافرێنەر، بیسەر و پاڵەوان کار لە بەستێنەکانی تری پێوەندیی کۆمەڵایەتی بکەن.

بۆ وەڵامدانەوەیەکی ڕێکوپێکی ئەم پرسیارانە کە پاڵەوانی نموونەئاسای ئەدەب لە سەردەمێکی دیاریکراودا چ کەسانێکن و چەشنی هەڵسوکەوتی شێوەیی و نموونەئاسای نووسەر لە هەمبەر ئەواندا بە چ جۆرێکەو، پاڵەوان و نووسەر، لە ناخی ئافراندنی ئەدەبیدا چ پێوەندییەکی دوولایەنەیان لەگەڵ بیسەردا هەیە، دەبێ بەتەواوی و بە شێوەیەکی بەربڵاو جیاجیا لە بارودۆخی ئابووریی و ئایدیۆلۆژیکی سەردەمی بەرباس بکۆڵدرێتەوە.

بەڵام ئەم پرسە مێژووییە دیاریکراوانە هەرهەمووی لە چوارچێوەی بوتیقایەکی تیۆریکدان کە رووبەڕووی ئەرکێکی گرنگی دیکە دەبنەوە. تاکو ئێستا هەر تەنیا ئاوڕمان لەو لایەنانە دایەوەکە شێوە لە پێوەندی لەگەڵ ناوەڕۆکدا دابیندەکەن، واتە لە پێگەی هەڵسەنگاندنی کۆمەڵایەتی وێناکراوی ئەم ناوەڕۆکەدا. ئێمە گەیشتووینەتە ئەم ئەنجامە کە هەرکام لە لایەنەکانی شێوە بۆ خۆی ئافرێندراوی جۆرێ کردارو پەرچەکرداری کۆمەڵایەتییە. بەڵام ئەوەشمان دەست نیشانکرد کە پێویستە شێوە لەروانگەیەکی ترەوە رەچاو بکرێ، واتە لە پێگەی شێوەیەکدا کە بەیارمەتی هەندێ کەرەستەی دیاریکراو هاتۆتەدی. ئەم بابەتە، بوارێکی بەربڵاو لە پرسە پێوەندیدارەکان بەتەکنیکی شێوەوە دەکاتەوە.

هەڵبەت ئەم پرسانەی تەکنیکی شێوە هەر تەنیا لە پانتایی دەرهەستکاریدایە کە لە پرسەکانی کۆمەڵناسیی شێوە جیادەکرێتنەوە: جیاکردنەوەی راستەقینەی واتای هونەریی شێوازێکی تایبەت لە دابینکاریی زمانیی ئەو شێوازە سەرناگرێ (وەک خوازە کە لەگەڵ ناوەڕۆکدا پێوەندیی هەیە، یان هەڵسەنگاندنی شێوەیی کە ئەم ناوەڕۆکە لە رێگەی دابەزاندن یان بەرەو تەشق بردنی بابەتەکەیەوە دەردەبڕێ).

مانای دەرگوتەیی خوازەو (کە جۆرێکە لەدابەشکردنەوەی بایەخەکان) توێ زمانییەکەی (گۆڕانکاریی مانایی) شتێ نین جگە لە روانگە جیاوازەکان بۆ یەک دیاردەی راستەقینە. بەڵام دەبێ روانگەی دووهەم سەر بە روانگەی یەکەم بێ. شاعیر بە مەبەستی دابەشکردنەوەی بایەخەکانە کە خوازە بەکاردەهێنێ نەک بەمەبەستی خواستی ئەنجامدانی پرۆڤەیەکی زمانی.



دەکرێ کۆی پرسەکانی شێوە لەسەر بناغەی کەرەستەکان- لێرەشدا و بۆ ئەم بابەتە، بەپێی زمان لە روانگەی زمانناسانەوە- هەڵسەنگێندرێ. لەم ساتەوەختەدا پێداچوونەوەی تەکنیک بۆ پرسیار لەسەر چۆنایەتی سەرچاوە زمانییە بەکارهاتووەکان لە بەڕێوەبردنی ئەرکی کۆمەڵایەتی هونەریی شێوەدا دێتە گۆڕێ. بەڵام ئەگەر نەزانین ئەم ئەرکە لەسەر چ شتێ دامەزراوە و ئەگەریش ماناکەیمان پێشوەخت روون نەکردبێتەوە، پێداچوونەوەی تەکنیک دەبێتە کارێکی بێ کەڵک.

هەڵبەت پرسەکانی تەکنیکی شێوە لە چوارچێوەی پرسێکدا کە ئێمە خوازیاری چارەسەرکردنی بووین تێدەپەڕن: سەرەڕای ئەمەش، بۆ لێکۆڵینەوە لەم بابەتە پێویست بوو لایەنی کۆمەڵایەتی و هونەریی شیعرمان بە شێوەیەکی زۆر قووڵتر و جیاوازتر شیکردبایەتەوە. لێرەدا تەنیا توانیومانە ئاراستە بنچینەییەکانی وەها شیکارییەک بەکورتی دەستنیشان بکەین. ئەگەر توانیبێتمان بۆچوونی کۆمەڵناسانەی بنەمای هونەری و ناوەکیی شێوەی شاعیرانە پیشانبدەین، دەتوانین ئەرکی خۆمان بەتەواو بزانین.

## (٢)

## لەمەڕ پێوەندیی ژێرخان و رووخانەوە

**میخاییل باختین**

یەکێ لە پرسە سەرەکییەکانی مارکسیزم، واتە پرسی پێوەندیی ژێرخان و رووخانەکان لە کۆمەڵێ لایەنی چارەنووسسازی خۆیدا پێوەندییەکی نزیکی لەگەڵ پرسەکانی فەلسەفەی زماندا هەیە. کەواتە مارکسیزم لە ڕێگەی چارەسەری یاخود لانی کەم پێداچوونەوەی ئەم پرسانەوە تەنانەت بە شێوەیەکی نەک زۆر وردەکارانەش بە زۆر دەرئەنجام دەگات. هەر کاتێ ئەم پرسە دێتە ئاراوە کە ژێرخان چلۆن ئایدیۆلۆژیا دابیندەکات، وەڵامێک دەدۆزرێتەوە کە هەڵبەت زۆریش ناڕاست نییە، بەڵام تارادەیەکی زۆر گشتی و کەواتە نائاشکراشە: **هۆکاریێتی**. ئەگەر مەبەست لە هۆکاریێتی، هۆکاریێتی میکانیک بێ هەر بەهەمان شێوە کە تاکو ئێستا لە ڕەوتی پۆزتیڤیستیی قوتابخانەی ناتورالیستیدا بووە- لەم حاڵەتەدا وەها پرسیارێک بەتەواوی درۆیە و لەگەڵ بناغەکانی ماتریالیزمی دیالکتیکیشدا ناخوێنێ و لە دژایەتیدایە. بەستێنی کاربردی وتەزای هۆکاریێتی مکانیکی زۆر سنووردارە. لە زانستە سروشتییەکانیشدا ئەم ئاقارە هاوکات لەگەڵ پەرەسەندنی



بەستێنی کاربردی ماتریالیزمی دیالکتیکی و وردبوونەوە لە تێزەکانی دادەبەزێ. کاربردی ئەم وتەزا نەگۆڕە لە پرسە سەرەکییەکانی ماتریالیزمی مێژوویی و کۆی زانستە ئایدیۆلۆژیکەکاندا، بە شێوەی یەکەمین، ڕەت دەکرێتەوە.

روونکردنەوەی پێوەندیی ژێرخان لەگەڵ دیاردەیەکی جیادا کە لە بەستێنی ئایدیۆلۆژیکی کامڵ و یەکبووی خۆی دابڕاوە، تەنانەت خاوەن بچووکترین بایەخێکی زانیارییەخشیش نییە. لە پلەی یەکەمدا، روونکردنەوەی گۆڕانکارییەکی ئایدیۆلۆژیکی دیاریکراو لە ناوەوەی بەستێنی ئایدیۆلۆژیای هاوڕێک لەگەڵیدا پێویستە، چونکە هەر بەستێنی ئایدیۆلۆژیکییەو لە ڕواڵەتی کۆمەڵێ بابەتی یەکبووو دابەشنەکراودا دەردەکەوێ کە توخمەکانی لە هەمبەر گۆڕانکاریی ژێرخاندا هەڵوێست وەردەگرن. بەم بۆنەشەوە، هەر جۆرە رونکردنەوەیەک دەبێ جیاوازیی چەندیی نێوان بەستێنە دوولایەنەکان رەچاو بکات و سەرجەم قۆناغەکانی گۆڕانکاری یەک لە دوای یەک و هەنگاوبەهەنگاو بپێوێ و بە دوایاندا بچێ. بە تەنیا لەم حاڵەتەدایە کە ئەنجامی شیکارییەکە نەک هەر نابێتە وێکچوونی رووکەشیانەی دوو دیاردەی بەڕێکەوت کە لە دوو ئاستدان، بەڵکو تەنانەت دەبێتە رەوتی کامڵبوونی کۆمەڵایەتی دیالکتیکی، ئەمەش ئەو رەوتەیە کە لە ژێرخانەوە هاتۆتە ئاراوەو، لە رووخانەکاندا بیچمی گرتووە.

پشتگوێ خستنی تایبەتمەندیی مادەی نیشانەناسانەی ئایدیۆلۆژیک لە پێگەی دابەزاندنی دیاردەی ئایدیۆلۆژیکدا بەم شێوەیەیە کە هەر تەنیا بایەخی مانا ئاشکراو ئەقلانییەکەی رەچاوو ڕاڤەدەکرێ (بۆ نموونە، مانای بە ئاشکرا پیشاندراوی بەرهەمێکی ئەدەبی: رۆمانی

روودین *بەناوی پیاوی زیادە*).[1] لەم حاڵەتەشدا، ئەم مانایە گرێ دەخواتەوە بە ژێرخانەوە (سەبارەت بەم نموونەی ئێستا (هۆکاری ژێرخانی) پێوئستە ئاوڕ لە لەناوچوونی ئاغەواتەکان بدەینەوە کە واتای سەرەکیی رۆمانەکە لەوەوە سەرچاوە دەگرێ). یان بەپێچەوانەوە، دەکرێ تەنیا ئاوڕ لە پاژێکی رووکەشیانە دەدرێتەوە، واتە پاژی "تەکنیکی"ی دیاردەی ئایدیۆلۆژیک (بۆ نموونە، تەکنیکی بیناسازی یان تەکنیکی مادەکانی رەنگی کیمیایی). لەم حاڵەتەشدا، ئەم پاژە بە شێوەیەکی راستەوخۆ دادەبەزێ بۆ ئاستی تەکنیکی بەرهەم هێنان.

ئەم دوو رێبازەی ئەنجامگیریی ئایدیۆلۆژیا لە ژێربنەما خۆی لە خۆیدا دیاردەی ئایدیۆلۆژیکی پشتگوێ دەخات. تەنانەت ئەگەر ئەم هاورێکییە پێشنیارکراوەش راست بێ و، تەنانەت ئەگەر *پیاوی زیادە* بەراستی لە پێوەندیی لەگەڵ لەناوچوونی ئابووریی ئاغەواتەکان لە ئەدەبدا دەرکەوتبێ، لە پێشدا بەهیچ جۆریک ئەم ئەنجامە نایەتە دەست کە ئەم بزووتنەوە ئابوورییانە لە رێگەی دیاردەی هۆکارێتی میکانیستییەوە پیاوە زیادییەکان یان لە رووپەڕی رۆمانەکاندا ئافرێندراو بێ (بۆشو بەتاڵبوونی وەها گریمانەیەک لە رۆژ ئاشکراترە). وێڕای ئەمەش، تا ئەوکاتەی دەوری تایبەتی *پیاوی زیادە*

١. نێوی رۆمانی بەناوبانگی ئورکینۆڤ کە *دانپیانانی جیلێک*–ە، گێڕانەوەی بەسەرهاتی نەوەی ساڵەکانی ١٨٣٠یە کە لە مێژووی رووسیا بەناوی "جیلی خەیاڵاوی" ناسراوەو تایبەتمەندییە بەرچاوەکەی برێتییە لە نەتوانین لە دەست بردن بۆ کار. دەکرێ نێوی ئەم کەسانەی خوارەوەش هەر لەم ریزەدا تۆمار بکرێ: کەسایەتی **کاری** لە رۆمانەکەی گنچارۆڤ، **دیلتۆڤ** لە *تاوانبار کێیە؟* بەرهەمی ئا. هێرستسن، **بازارۆڤ** لە *باوکان و منداڵان* بەرهەمی تۆزیکنۆڤ.



لە بنەمای بەرهەمی رۆمانیداو دەوری تایبەتی رۆمان لە کوێ ژیانی کۆمەڵایەتیدا روون نەکرابێتەوە، ئەم هاورێکییە هەڵگری بایەخێکی هەرە بچووکی زانیاریدەرانەش نییە.

ئاخۆ ئەمە بەڵگە نەویست نییە کە لە نێوان گۆڕانکاریی بنەمای ئابووریی و بەدیهاتنی *پیاوی زیادە* لە رۆماندا رێگایەکی دوورودرێژ لە ئارادایە کە بەسەر کۆمەڵێ بەستێنی جیاواز لە باری چۆنیەتییەوە تێدەپەڕێ کە هەر کام لەم بەستێنانەش بۆ خۆی خاوەن سروشتی تایبەت و تاقمێ یاساو رێسای تایبەتە؟ ئایا ئەمە ئاشکرا نییە کە *پیاوی زیادە* بە شێوەیەکی سەربەست و بەبێ هیچ چەشنە پێوەندییەک لەگەڵ توخمە پێکهێنەکانی دیکەی رۆماندا لەوێ بە دیارنەکەوتووە؟ راست بە پێچەوانەوە، رۆمان بەگشتی وەکو گشتێکی یەکبوو و ئەنداموار کە سەر بە یاسا تایبەتەکانی خۆیەتی پێکهاتووە. سەرلەبەری توخمەکانی تری رۆمان، وەک پێکهاتە و شێوازەکەی، ئاکامی هەر ئەم بابەتەن. بەڵام جگە لەمانەش، بنەمادارێتی رۆمان لە پێوەندیی نزیک لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی تر لەکۆی ئەدەبدا سەری گرتووە.

پرسی پێوەندیی دوولایەنەی ژێربنەماو رووبنەماکان، کە پرسێکی زۆر ئاڵۆزیشە و چارەسەریی سوودبەخشی ئەم پرسە بەندە بە کۆی کەرەستە سەرەتاییەکانەوە، دەکرێ تاڕادەیەکی زۆر لە رێگەی هەڵسەنگاندنی کەرەستە گوتەییەکانەوە روونبکرێتەوە.

لە راستیدا بنەڕەتی ئەم پرسە، لەو بەستێنەی ئێمە لێی دەکۆڵینەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەم پرسیارە کە چلۆن واقیع (واتە، ژێربنەما) نیشانە دابیندەکاتو، چلۆن نیشانە ئەو واقیعەی لە گۆڕانکاریدایە دەنوێنێتەوەو دەری دەخات؟

تایبەتمەندیی وشە لە پێگەی نیشانەیەکی ئایدیۆلۆژیکیدا، بەو شێوەیەی کە لە بەشی یەکەمدا دیاریکرا و روونکرایەوە، دەیکاتە یەکێک لە باشترین کەرەستەکانی چارەسەریی بنچینەیی ئەم پرسە. لە بابەت پێوەندیی نێوان وشە و واقیعەوە، ئێمە پتر ئامادەبوونی گشتگیری کۆمەڵایەتی وشەمان بەلاوە مەبەستە تا رەسەنایەتی نیشانەناسانەی وشە. گومانیش لەوەدا نییە کە وشە دەچێتە نێو سەرجەم پێوەندییەکانی نێو کۆمەڵگاوەو، لە پێوەندیو هاوکاریدا، لەو پێوەندییانەی کە سەرچاوەیەکی ئایدیۆلۆژیکیان هەیە، لە رووبەڕووبوونەوە لەناکاوەکانی ژیانی رۆژانەدا، لە پێوەندییە سیاسییەکاندا و... هتد ئامادەیە.

وشەکان بە تانوپۆی ئایدیۆلۆژیکەوە چێنراون کە هاوکات تانوپۆی سەرجەم پێوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لە هەموو بەستێنە جیاجیاکاندا پێکدەهێنن. کەواتە ئاشکرایە کە وشە هەستپێکراوترین نیشانەی سەرجەم گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکانە، تەنانەت ئەو گۆڕانکارییانەش کە تازە خەریکی پەرەسەندنن، ئەو گۆڕانکارییانەی کە هێشتا بەتەواوی بیچمیان نەگرتووە و هێشتاش رێگەی سیستەمە ئایدیۆلۆژیکو بنەمادارو پێکهاتەمەند و تەواو بیچمگرتووەکانیان بەتەواوی هەموار نەکردووە و، وشە لێرەدا رووبەرێک پێکدێنێ کە شوێنگەی کۆبوونەوەی  چەندایەتی و هێمنی ئەو گۆڕانکارییانەیە کە هێشتا نە دەرفەتی وەدەست هێنانی چۆنایەتییەکی ئایدیۆلۆژیکی تازەیان هەیە و نەک دەرفەتی بنیاتنانی شێوەیەکی ئایدیۆلۆژیکی تازەو کامڵ. وشە دەتوانێ بچووکترین و ناهێمنترین قۆناغەکانی تێپەین لە گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکاندا تۆمار بکات.



ئەوەی ناوی دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی لێ نراوەو بەپێی تیۆریی پۆلمانۆڤ و زۆربەی مارکسیستەکان جۆرێ ئاڵقەی نێوەنجی نێوان بنەمای کۆمەڵایەتی- سیاسی و ئایدیۆلۆژیا بە مانا سنووردارەکەی (زانست، هونەرو لەم چەشنە) پێکدێنێ، لە رواڵەتی کردەی دوو لایەنەی گوتەییدا دێتەدی و بەدیاردەکەوێ. ئەگەر دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی ئەم رەوتە راستەقینەیەی پێوەندی و کردەی دوو لایەنەی گوتەییدا (یان بە شێوەیەکی گشتگیرتر، نیشانەناسانە) رەچاو بکەین، ئەوا دەگۆڕدرێ و دەبێتە چەمکێکی میتافیزیکی یان ئوستوورەیی (رۆحی کۆیی، کۆنەست، "رۆحی هونەری" و لەم چەشنە).

دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە پێگەیەکی ناوەکی و زەینیی کەسەکاندا (لە "گیان"ی ئەو کەسانەی پێوەندییان پێکەوە هەیە) لە ئارادا نییەو، بەپێچەوانەوە بەتەواوی دەرکەوتەیەکی دەرەکی دەستەبەر دەکات کە لە واژە و، حاڵەت و کردەوەی مرۆڤدا دەبیندرێ. لەم دەروونناسییەدا هیچ شتێکی دەرنەبڕدراو لە گۆڕێدا نییە. هەموو شتێ ئاشکراو لەگۆڕێدایە و بە شێوەیەکی زۆر بەرچاو لە کەرەستە گوتەییەکاندا بوونی هەیە.

پێوەندییەکانی بەرهەمهێنان و ئەو بنەما کۆمەڵایەتی- سیاسیانەی کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ بەندن بەم پێوەندییانەوە سەرجەم پێوەندییە گوتەییە گونجاوەکانی نێو کەسەکان و کۆی شێوەو ئامرازەکانی پێوەندیی گوتەیی دیاریدەکەن: لە کارو لە ژیانی سیاسی و لە داهێنانی ئایدیۆلۆژیکدا. لەلایەکی ترەوە، شێوەکان و هەروەهاش واتاگەلی لایەنەکانی گوتار بە شێوەی بارودۆخ و فۆرم و جۆرەکانی پێوەندیی گوتەیی بە دیاردەکەون.

دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە هەنگاوی یەکەمدا بریتییە لە ئاقاری دەوروبەری سەرجەم چەشنەکانی لایەنەکانی گوتارو، لەم ئاقارەشدایە کە هەموو شێوەو لایەنەکانی ئافراندنە ئایدیۆلۆژیکە یەک لە دوای یەکەکان دەردەکەون: وتوویژە سەرپێییەکان، گۆڕینەوەی بیروڕا لە هۆڵی شانۆ یان هۆڵی مۆسیقا، لە کۆبوونەوە جیاجیا کۆمەڵایەتییەکاندا، بیروڕا گۆڕینەوەی بەرێکەوت، شێوەی پەرچەکرداری گوتەیی لە هەمبەر واقیعەکانی ژیان و رووداوە رۆژانەییەکاندا، گوتاری ناوەکی و خودئاگایی، سیستەم و چوارچێوەی کۆمەڵایەتی و لەم تاقمە. دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لە بنەڕەتدا و لە لایەنگەلی جۆراوجۆری "گوزارە داڕشتن"دا بەشێوەی جۆرە جیاوازەکانی گوتار، بەناوەکی و دەرەکییەوە، دەردەکەوێ. ئەم ئاقارە تاکو ئێستا بە هیچ شێوەیەک نەکەوتۆتە بەر هەڵسەنگاندن و پێداچوونەوە. هەڵبەت کۆی ئەم لایەنە گوتەییانە لەگەڵ چەشنەکانی دیکەی لایەن و کردارو پەرچەکردارە نیشانەناسانەکاندا پێوەندییان هەیە کە شانۆی بێ ئاخاوتن، زمانی ئاماژە، هەڵسوکەوت، هاتوچۆ دیاریکراوەکانی تر و چەند شتی تر لەم دەستەیەش هەر لەو خانەیەدان.

ئەم شێوە جیاجیایانەی کردارو پەرچەکرداری گوتەیی لەگەڵ بارودۆخ و هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی تایبەتدا پێوەندییەکی نزیکیان هەیەو لەبەرامبەر سەرجەم سەرو ژێرەکانی دۆخی کۆمەڵایەتیدا هەڵوێست وەردەگرن. لەم ڕێگەیەشەوەیەو لە ناخی دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتیدا کە لە واژەدا گیرساوەتەوە، گۆڕانکاری و کاریگەریگەلێکی نادیار کۆدەبنەوە کە دواتر شێوەی تایبەتی دەربڕینی خۆیان لە داهێنانە ئایدیۆلۆژیکەکاندا بەتەواوی دەدۆزنەوە.



لەو وتانەی سەرەوە دەکرێ بەم ئەنجامە بگەین کە دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی دەبێ لە دوورەوە هەڵبسەنگێندرێ: یەکەم لە باری ناوەڕۆکەکەیەوە، واتە لە باری ئەو واتایانەوە کە لە ساتەوەختە جیاجیاکاندا بەدیهاتوون و، دووهەم لەڕووی جۆرەکان و شێوەگەلی گوتارەوە کە لە ڕێگەی ئەوانەوە ئەم واتایانە بیچم دەگرن، راڤە دەکرێن، دێنە دی و رواڵەتی هەست و ئەندێشە دەگرنەخۆ.

تاکو ئێستا پێداچوونەوەی دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بۆ روانگەی یەکەم سنووردار کراوەتەوە، واتە تەنیا واتا شاراوەکەی روونکراوەتەوە. سەرەڕای ئەمەش، تەنانەت ئەم پرسیارە بە راشکاوی ئاراستە نەکراوە کە دەبێ لە کوێدا بەڵگە بابەتیانەکان، واتە دەربڕینی نایەککگرتووی دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی بدۆزرێتەوە؟ لەم نێوەندەشدا، چەمکگەلی **هۆشیاری، خود و جیهانی ناوەکی** پێداویستیی گەڕان بە دوای شێوە مادی و بەرچاوەکانی دەربڕینی دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتییان وەلا ناوە و، لەئاکامدا، دەورێکی چەواشەکارانەشیان گێڕاوە.

لە پاڵ ئەمانەشدا، نابێ نکوولی لەوە بکەین کە پرسی شێوە بەرچاوەکانی دەربڕینی دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی گرنگایەتی زۆری هەیە. هەڵبەت لێرەدا نەک بابەتی سەرچاوەکانی ناسینی ئێمە لە دەروونناسیی پێکهاتەی کۆمەڵایەتی لەسەردەمێکی دیاریکراودا گرنگە و (بۆ نموونە: بیرەوەرییەکان، نامەکان، بەرهەمە ئەدەبییەکان) نەک سەرچاوەکانی تێگەیینی ئێمە لە "رۆحی زەمەن". پرسەکە بەتایبەت لەسەر شێوەکانی بابەتیبوونی ئەم رۆحەیە، واتە شێوەکانی پێوەندی لە چوارچێوەی ژیان و لە ڕێگەی نیشانەکانەوە. چەشنناسیی ئەم شکڵانە بە پرسێکی هەرە گرنگ و چارەنووسسازی

ماركسیزم دادەنرێ. لە درێژەی ئەم باسەو لە پێوەندیی لەگەڵ پرسی گوزارەدارشتن و گوتاردا ئاماژەیەكیش بۆ رەشنووسە زمانییەكان دەكەین. لەم بارەوە تەنیا ئەم خاڵە دەردەبڕین: هەر سەردەمێكی كۆمەڵایەتی لە پێوەندیی كۆمەڵایەتی-ئایدیۆلۆژیكدا خاوەن رەشنووسی شێوە تایبەتەكانی خۆیەتی. لەگەڵ هەر تاقمێكی جیاوازی شێوەكانی رەشنووسدا، واتە لەگەڵ هەر شێوەیەكی گوتاری كۆمەڵایەتیدا، كۆمەڵێك واتا پێكەوە تەبان. لە نێوان شێوەی ئەم پێوەندییەدا و (بۆ وێنە، پێوەندیی نێو هاوكاران لە بەستێنێكی تەواو هونەریدا) شكڵی گوزارەبێژی (وەك "وەڵامی كورت"لە "زمانی پیشە"دا جۆرێ یەكێتی ئەندامەوار لە ئارادایە كە هیچ هۆكارێك ناتوانێ هەڵی بوەشێنێتەوە و تێكی بدات. هەر بەم بۆنەوەیە كە پۆلینكاریی شێوەكانی گوزارە دارشتن پێویستە بەند بێ بەپۆلێنكاریی شێوەكانی پێوەندیی گوتەییەوە. شێوەكانی پێوەندیی گوتەیی بەندن بە پێوەندییەكانی بەرهەمهێنان و بنەمای كۆمەڵایەتی-سیاسییەوە. پێداچوونەوەیەكی وردەكارانەتر گرنگایەتی هەرە زۆری بابەتی زنجیرە قۆناغەكان لە رەوتی كردارو پەرچەكرداری گوتەییدا پتر دەردەخاو، كاریگەرێتی بەهێزی رێكخستنی زنجیرە قۆناغی پێوەندییە كۆمەڵایەتییەكان لەسەر شێوەكانی گوزارەدارشتن پتر ئاشكرا دەكاتەوە. هەروەهاش رەچاوكردنی رێسا تایبەتەكانی "یاساكانی هەڵسوكەوت"، "گوتەزانی" و شێوەكانی دیكەی رێكخستنی گوزارەدارشتن لەگەڵ رێكخستنی زنجیرە قۆناغداری كۆمەڵگادا، بایەخێكی بێسنووریان بۆ روونكردنەوەی شێوەگەلی جیاجیای هەڵسوكەوت هەیە.(٢)

٢. پرسی رەشنووسەكانی زمانی خۆماڵی تەنیا بەم دواییانە سەرنجی زماناسان و



دەزانین كە هەموو نیشانەكان بەرهەم و ئاكامی رێككەوتنی نێوان كەسانێكن كە لە درێژایی رەوتی كردارێكی دوولایەنەدا و بە شێوەیەكی كۆمەڵایەتی رێكخراون. بەم بۆنەشەوەیە شێوە جیاجیاكانی نیشانە هەر بە هەمان ئەندازە بەندن بەرێكخستنی كۆمەڵایەتی ئەم كەسانەوە كە بەندن بەو بارودۆخەوە كە كرداری دوولایەنە تێیاندا روودەدا. هەر چەشنە گۆڕانكارییەك لەم شێوانەدا دەبێتە هۆی گۆڕانی نیشانە. یەكێك لە ئەركەكانی زانستی ئایدیۆلۆژیاكان بەراستی پێداچوونەوەی ئەم گۆڕانكارییە كۆمەڵایەتییەی نیشانە زمانییەكانە. تەنیا وەها رووبەڕووبوونەوەیەك دەتوانێ وەڵامێكی دیاریكراو بۆ پرسی كاریگەرێتی دوولایەنەی "نیشانە"و "بوون" بداتەوە. ئەمەش تەنیا بەم مەرجەیە كە رەوتی دیاریكردنی لە ئامێزگرتنی هۆدارانەی "نیشانە" لەلایەن "بوون"-ەوە بە شێوەی تێپەڕینی راستەقینەی بوون بۆ نیشانە و بە شێوەی رەوتی شكانەوەی دیالكتیكی "بوون" لە نیشانەدا بەدیار بكەوێ. بۆ ئەم مەبەستە، رەچاوكردنی رێسا رێبازناسانەكانی خوارەوە پێویستە:

١. جیاكردنەوەی ئایدیۆلۆژیا لە واقیعی مادیی نیشانە (ئەم جیاییە لە رێگەی سەقامگیربوونی ئایدیۆلۆژیا لە بەستێنی **هۆشیاری**، یان سەرجەم بەستێنە بگۆڕو پێناسەهەڵنەگرەكانی ترەوە سەر دەگرێ).

٢. جیانەكردنەوەی نیشانە لە شێوە دیاریكراوەكانی پێوەندیی كۆمەڵایەتی (بەڵگە نەویستە كە نیشانە پاژو بەشێكە لە سیستەمێكی

فەلسەفەكارانی بۆ لای خۆی راكێشاوە. لێئو شپیتزێر لە وتارێكدا بەناوی Italiensche Umgangspra(1992) لەو كەسانەیە كە بۆ یەكەمجار بە شێوەیەكی شێلگیرانە، بەڵام بەبێ رووبەڕووبوونەوەی كۆمەڵناسانە لەم پرسەی كۆڵیوەتەوە.

پێوەندیی کۆمەڵایەتی ڕێکخراو و، لە دەرەوەی ئەم سیستەمەشدا هیچ چەشنە بوونێکی نییە، مەگەر بە شێوەی چشتێکی سروشتی).

٣. جیانەکردنەوەی پێوەندیی و شێوەکان لە خاڵە بنچینەییەکاندا (واتە لە ژێربنەمادا هەر نیشانەیەکی ئایدیۆلۆژیک وەک نیشانەی زمانی، لە ویۆە کە لە ڕەوتی پێوەندیی کۆمەڵایەتیدا دێتە دی، لەگەڵ ئاسۆی کۆمەڵایەتی سەردەم یان تاقمێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا دیاری دەکرێ).

تاکو ئێستا ئاماژە بۆ بابەتی شێوەکانی نیشانە نەکراوە- نیشانەیەک کە بەندە بە شێوەکانی کرداری دوولایەنەی کۆمەڵایەتییەوە. ئێستا لە لایەنێکی دیکە دەکۆڵێتەوە: لە ناوەڕۆکی نیشانەو لەو تایبەتمەندییە بایەخدارانەیەی لەگەڵ هەموو ناوەڕۆکەکاندا تەباو هاوڕێیە.

لە قۆناغە جیاجیاکانی پێشکەوتنی کۆمەڵگادا، هەندێ بابەتی تایبەت و سنووردار وەبەرچار دەکەون کە ڕووبەڕووی سەرنجی پێکهاتنی کۆمەڵایەتی دەبنەوەو، لە ئەنجامدا بایەخێکی تایبەت بۆ خۆیان دەستەبەردەکەن. تەنیا ئەم تاقمە بابەتەن کە دەبنە هۆی بەدیهاتنی نیشانە و، لە ڕێگەی نیشانەکانەوە بۆ توخمێکی پێوەندیی دەگۆڕدرێن. چلۆن دەکرێ ئەم تاقمە بابەتە "بایەخگرتوو"ە دیاری بکرێن؟

بە مەبەستی ئەوەی کە بابەت پێوەندیی بە ئاقارێکی واقیعییەوە هەبێ و بچێتە ناو ئاسۆی کۆمەڵایەتی تاقمەکانەوە و، پەرچەکرداری نیشانەیی- ئایدیۆلۆژیکی هەڵخڕێنێ، ئەوا پێویستە پێوەندیی بەبارودۆخی کۆمەڵایەتی- ئابووریی ئەم تاقمەشەوە هەبێ و، هەروەها دەبێ پێوەندیشی بە بنەڕەتەکانی بوونی مادەوە هەبێ. هەڵبەت خووە تاکەکەسییەکان ناتوانن لێرەدا دەور ببینن، چونکە



نیشانە لە ژینگەی کۆمەڵایەتی و لە نێو کەسەکاندا دێتەدی. کەواتە، بابەت دەبێ بەناچار مانایەکی نێوکەسی بدۆزێتەوە و تەنیا لەم ڕێگەیەوەیە کە دەتوانێ ببێتە هۆی بیچمگیریی نیشانە. بە واتایەکی تر، تەنیا کەرەستە دەتوانێ بچێتە ئاقاری ئایدیۆلۆژییەوە و لەوێ ئەو شێوەیە بگرێتە خۆی کە بایەخی کۆمەڵایەتی هەیە.

بەم بۆنەوە سەرجەم تایبەتمەندییەکانی "بەها و بایەخ" کە خاوەن سروشتێکی ئایدیۆلۆژیکن، ئەگەرچی لە ڕێگەی دەنگی کەسەکانەوە (وەک لە وشەکاندا) یان بە شێوەیەکی گشتیتر لە ڕێگەی میکانیزمێکی تاکەکەسییەوە هاتوونەتە دی، بەڵام هەندێ تایبەتمەندیی بەها کۆمەڵایەتییەکان دەگرنەخۆ کە ئەمانەش بەرهەمی ڕێککەوتن و تەنیا بەناوی ئەم ڕێککەوتنەشەوەیە کە لە کەرەستە ئایدیۆلۆژیکەکاندا لایەنێکی دەرەکی بۆ خۆیان دەستەبەر دەکەن.

گریمان ئەو واقیعەی دەبێتە هۆی بیچمگیریی نیشانەیەک ناوی **واتایە**. هەر نیشانەیەکی بیچمگرتوو، خاوەن واتای تایبەتی خۆیەتی. بەم چەشنە هەموو وێنا گوتەییەکان واتای تایبەتی خۆیان هەیە.

واتای ئایدیۆلۆژیک بەردەوام تایبەتمەندیی بایەخی کۆمەڵایەتی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ. هەڵبەت کۆی تایبەتمەندییەکانی بایەخی کۆمەڵایەتی واتا ئایدیۆلۆژیکەکان، دەچنە نێو هۆشیاریی تاکەکەسییەوە کە ئاکامی هەموو ئایدیۆلۆژیاکانەو، لەوێ دەگۆڕدرێن و دەبن بە نیشانەکانی بەها تاکەکەسییەکان؛ چونکە هۆشیاریی تاکەکەسی وەکو نیشانەگەلێکی تایبەت بەرەو لای خۆی دەیان کێشێ، بەڵام سەرچاوەکەیان لە هۆشیاریی تاکەکەسیدا نییە. تایبەتمەندیی بایەخ لە سروشتی خۆیدا "نێو-کەسی"یە. لوورەی حەیوانێک، وەکو

پەرچەکرداری ئورگانیزمی تاک، هەڵگری تایبەتمەندیی بایەخەکان نییەو دیاردەیەکی تەواو سروشتییە.

لوورە، بۆ نموونە، بەند نییە بە دۆخی کۆمەڵایەتییەوە. بەم بۆنەشەوە، هیچ کات پۆلێنبەندیی نیشانەناسانەی بۆ نادۆزرێتەوە. واتاو شێوەی نیشانەی ئایدیۆلۆژیک پێوەندیی نزیک و وێکچوویان لەگەڵ یەکتردا هەیە و، لە جیهانی دەرهەستکاریدا لێکدی جیا نابنەوە چونکە لە راستیدا، لە دوا شیکاریدا، هێزو وزەو دۆخێکی ئابووریی یەکبووو توخمێکی نوێی لە واقیع دەخەنە سەر ئاسۆی کۆمەڵایەتیو، لە باری کۆمەڵایەتییەوە، گونجاوو لەباری دەکەنەوە. واتاو شێوە هەندێ هزرو شێوەی پێوەندیی ئایدیۆلۆژیک (وەک ناسین، هونەری، ئایینی و لەم تاقمە) دادەهێنن، ئەمانەش هەر ئەو واتاو شێوانەن کە چۆنیەتی دەربڕینی نیشانەناسانە دیاریدەکەن.

کەواتە، واتاکان و شێوەکانی داهێنانی ئایدیۆلۆژیک لە یەک بێشکەدا نەشونما دەکەن و، لە بنەڕەتدا دووڕووی یەک دراون. لە ئاقاری وشەدایە کە دەکرێ ئەم رەوتەی یەکبوونی واقیع و ئایدیۆلۆژیا و، لە دایکبوونی واتاو شێوەکان بە باشترین شێوە ببیندرێ.

ئەم رەوتەی گۆڕانکاریی ئایدیۆلۆژیک لە زماندا و، لە پێوانەیەکی بەربڵاوتردا، لە جیهان و مێژووشدا نوێندراوەتەوە و، بۆتە بابەتی توێژینەوەگەلی دێرینەناسیی مانا زمانییەکان. ئەمەش زانستێکە کە یەکگرتوویی ئەو ئاقارانەی واقیع روون دەکاتەوە کە لە ئاسۆی کۆمەڵایەتی مرۆڤگەلی پێش مێژوو هێشتا جیانەکراونەتەوە. ئەم بابەتە لە رووبەرێکی بەرتەسکدا، لە بابەت سەردەمی هاوچەرخیشەوە هەر راستە، چونکە واژە هەر بەو شتە لە قەڵەم دەدەین کە هەڵسوکەوتە



هەست پێنەکراوەکانی بوونی کۆمەڵایەتی بە باشترین شێوە دەنوێنێتەوە.

بوونی نوێندراو لە نیشانەدا هەر تەنیا خۆی لە نیشانەکەدا نانوێنێتەوە، بەڵکو لەوێشدا دەشکێتەوە. چ هۆکارێک ئەم شکانەوەیەی بوون لە نیشانەی ئایدیۆلۆژیکدا دیاریدەکات؟ رووبەڕووبوونەوەی قازانجە کۆمەڵایەتییە لێکدژەکان لە سنووری کۆیەکی نیشانەناسانەی یەکبوودا، واتە ململانێی چینایەتی.

چینی کۆمەڵایەتی و کۆی نیشانەناسانە بەسەر یەکتردا بەتەواوەتی ناشکێنەوە. مەبەستی ئێمە لە بابەتی دووهەم، ئەو کۆیەیە کە رەمزو پێوەندییەکی ئایدیۆلۆژیک بەکاردەهێنێ. بەم چەشنە، چینە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان زمانێکی یەکبوو بەکاردەهێنن. لە ئەنجامدا هەر نیشانەیەکی ئایدیۆلۆژیک بۆ خۆی شەڕگەی تایبەتمەندییە جیاجیاکانی بایەخە لێکدژەکانە. نیشانە بۆ ئاقاری ململانێی چینایەتی دەگۆڕدرێ. ئەم رەهەندە "چەندلەحنی" وکۆمەڵایەتییەی نیشانەی ئایدیۆلۆژیک بە تایبەتمەندییەکی هەرە گرنگ دادەنرێ. لە راستیدا هەر ئەم رووبەڕووبوونەوەیەی تایبەتمەندییەکانی بایەخی لێکدژە کە نیشانەی زیندوو و بگۆڕ هێشتۆتەوە.

ئەگەر نیشانە لە تەنشتگەلی ململانێی کۆمەڵایەتی بەدوور بێ و لەو ململانێیە دوور بخرێتەوە، بێگومان خەسڵەتی خۆی دەدۆڕێنێ و دەگۆڕدرێ و دەبێتە تەمسیل و، یاخود دەبێ بە بابەتی لێکۆڵینەوەگەلی واژەناسان و چیدی نابێتە ئامرازێکی ئەقڵانی و زیندوو بۆ کۆمەڵگا. بیرگەی مێژوویی مرۆڤایەتی لێواولێوە لەم نیشانە ئایدیۆلۆژیکە مردووانە کە ناتوانن بەستێنێک بۆ رووبەڕووبوونەوەی لەحنە کۆمەڵایەتییە زیندووەکان پێک بهێنن. تەنیا ئەو کاتە زیندوون

که واژەناس و مێژوونووسان بیرەوەریی ئەم نیشانانە دەپارێزن و هێشتا تێیاندا تیشکێک لە ژیان هەر لە ئارادایە.

بەڵام هەر ئەم هۆکارە تایبەتمەندییەکی زیندوو و بگۆڕ دەبەخشێتە نیشانە ئایدیۆلۆژیکەکەو، دەیکا بە ئامرازێک بۆ شکانەوە و بە لاڕێدابردنی بوون. چینی زاڵ خوازیاری ئەوەیە خەسڵەتێکی پیرۆز و لەوپەڕی چینەکانەوە بداتە نیشانە ئایدیۆلۆژیکەکان تاکو لە ململانێی تایبەتمەندییەکانی بەهای کۆمەڵایەتیدا بیخنکێنێ و یاخود لەناو خۆیدا بیتوێنێتەوە و نیشانەکە "تاکلەحنی" بکاتەوە.

لە راستیدا هەر نیشانەیەکی ئایدیۆلۆژیکی بەشێوەیەک لە شێوەکان زیندووە. هەر چەشنە رەخنەیەکی زیندوو لەوانەیە بۆ پیاهەڵگوتن بگۆڕدرێ و هەر هەقیقەتێکی زیندووش ناشێ لە روانگەی هەندێ کەسەوە بە شێوەی گەورەترین درۆکان دەرنەکەوێ. ئەم دیالکتیکە ناوەکییەی نیشانەش بەتەواوەتی ئاشکرا نابێتەوە مەگەر لەسەردەمگەلی قەیرانی کۆمەڵایەتی و کەفوکوڵی شۆڕشگێڕانەدا. لەبارودۆخی ئاسایی ژیانی کۆمەڵایەتیدا ئەم دژایەتییە شاراوەیەی نێو هەموو نیشانە ئایدیۆلۆژیکەکان دەرناکەوێ، چونکە لە ئایدیۆلۆژیای زاڵ و مسۆگەرکراودا نیشانەی ئایدیۆلۆژیکی بەردەوام تۆزی کۆنەپەرستانە دەنوێنێ و بەواتایەکی تر، دەیەوێ بەهەر شێوەیەک بووە قۆناغی پێشووی رەوتی دیالکتیکی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی نەگۆڕ بهێڵێتەوە و هەقیقەتی دوێنێ بۆ ئەمڕۆش بەبایەخ و بڕواپێکراو پیشان بدات. تایبەتمەندیی شکانەوەیی و تاڕادەیەک چەواشەکارانەی نیشانەی ئایدیۆلۆژیک لە سنووری ئایدیۆلۆژیای زاڵدا هەر لێرەوە سەرچاوە دەگرێ.



بەم شێوەیەیە کە پرسی پێوەندیی ژێرخان و رووخانەکان ئاراستە دەکرێ. هەڵبەت ئێمە هەر تەنیا پەرژاینە سەر قامک خستنە سەر بابەتێتی هەندێ لایەنی ئەم پرسە و تەنیا هەوڵی ئەوەمان دا رووناکی ببەخشینە رێگەیەک کە توێژینەوە سوودبەخشەکان لەم ئاقارەدا پێویستە بە دوایدا بچن. هەروەهاش ئاماژە کردن بۆ جێگە و پێگەی فەلسەفەی زمان لەم باسەدا پێویست بوو. لێکدانەوەی نیشانەی زماننا‌سانە ئەگەری بینینی بەردەوامبوونی رەوتی بزاڤی دیالکتیک و گۆڕانکاری لە ژێرخانەوە بۆ رووخان بە باشترین شێوە دەستەبەردەکا. روونکردنەوەی دیاردە ئایدیۆژیکەکان لە رێگەی هۆدارێتی میکانیستییەوە، لە ئاقاری فەلسەفەی زماندا، دەکرێ ئاسانتر لەهەر شوێنێکی تر بنبڕ بکرێ.

## (٣)

# پێداچوونەوە ئەدەبییەکانی ئەمڕۆ

میخاییل باختین

دەستەی نووسەرانی گۆڤاری نوومیمیر ویستوویەتی بیروڕام سەبارەت بە دۆخی هەنووکەیی توێژینەوە لە بەستێنی ئەدەبدا بزانێ.

وەڵامدانەوەی پرسیارێکی لەم چەشنە بێشک نابێ شێوەیەکی رەها لە خۆ بگرێ. ئێمە کاتێ دەربارەی قۆناغی هەنووکەیی روانگەکانمان دەردەبڕین، رووبەڕووی هەڵە و هەڵەکاری دەبینەوە و هەر بۆیەش نابێ ئەم خاڵە وەپشت گوێ بخەین. سەرەڕای هەموو ئەمانەش هەوڵدەدەم بەرسڤێک ئاراستە بکەم.

زانستی ئەدەبیی ئێمە هەڵگری گەلێک ئامرازی گرنگە: ئێمە خاوەن کۆمەڵێ توێژەری جیدین کە لە ناویاندا تاقمێ گەنجی زۆر خاوەنبەهرە وەبەرچاو دەکەون. هەروەهاش خاوەن کۆمەڵێ نەریتی زانستیی مەزنین کە هەم لە رابردوودا بیچیمان گرتووە (وەک پوتبینا و سلۆڤسکی) هەم لە قۆناغی هەنووکەییدا (وەک تینیانۆڤ، توماشۆڤسکی، ئایختباوم، گوکوڤسکی و ئەوانی تر). هەڵبەت



بارودۆخێکی دەرەکی دەرخۆریشمان هەیە (ئەنجوومەنە توێژینەوەییەکان، گروپە لێکۆینەوەییەکان، بودجەی چاک، دەزگای بڵاوکردنەوە). بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا (بەتایبەت لەم دە ساڵەی دواییدا) چما بەستێنی توێژینەوە نەیتوانیوە لەو دەمودەزگا و تایبەتمەندییانەی لەبەردەستیدایە کەڵکی تەواو وەربگرێ و، نەیتوانیوە وەڵامێکی شیاوی چاوەڕوانییەکانی ئێمە بداتەوە. گەر بە بێپەروایی لە قەڵەمی نەدەین، هیچ دەرئەنجام و دۆزینەوەیەک ئەگەری دەرخستنی پرسە گشتییەکان لە روانگەیەکی نوێوە دەستەبەر ناکات و، هیچ کام لە بەشەکانی ئەم دیاردە تایبەتانە، لەم جیهانە بێکۆتاییەی ناوی "ئەدەب"ی لێ نراوە، روون نابێتەوە و هیچ هەوڵێکی جیددی و سودبەخشیش بۆ بەرگری کردن لە تیۆرییەک نادرێ.

ئەوەی ئەمڕۆ بەسەر ئاقاری توێژینەوەدا زاڵە جۆرێ ترسە لە رووبەڕووبوونەوەی مەترسی، ترس لە رووبەڕووبوونەوەی مەترسی لە هەمبەر گریمانەیەکدا. لە راستیدا زانستی ئەدەب زانستێکی هێشتا گەنجە کە بەپێچەوانەی زانستە وردەکارانە و بەڵگەییەکان خاوەنی ئەم مێتۆدە قورس و قایمانە نییە کە لە کردەدا تاقیکرابێتەوە. هەر بەم بۆنەشەوە، نەبوونی رووبەڕبوونەوە و ململانێ لە هۆگرییە جیاجیاکانداو ترس لە بێبایەخترین گریمانەی بێپەروا لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی زاڵبوونی کێشە و کەس لە کەسی و، لەو بابەتەشەوە هیچ کەموکورییەکمان نییە.

ئەمە وەسفێکی گشتی بوو لە هەلومەرجی ئێستای لێکۆڵینەوە لەلای ئێمە. بەڵام وەسفی گشتی هیچکات راستەقینە نییە. لەم رۆژگارەی ئێمەشدا کۆمەڵێ بەرهەمی سوودبەخش بڵاودەکرێنەوە کە هێندەش بێبایەخ نین (بەتایبەت ئەو بەرهەمانەی لە مێژووی ئەدەب

دەکۆڵنەوە). چەندین لێکدانەوەی تایبەتو کاریگەرو وردەکارانەش بڵاوبوونەتەوە. با ئەوەش بڵێم کە کۆمەڵێ رووداوی گەورە هەن کە ناچنە نێو خانەی ئەو وەسفە گشتییەی منەوە. مەبەستم کۆمەڵێ بەرهەمە وەک *رۆژئاواو رۆژهەڵات* نووسینی ن. کۆنراد، *بوتیقای ئەدەبی رووسیی کۆن* بەرهەمی د. لیخاچۆڤ و، *سەرنجگەلێک لەسەر سیستەمە نیشانەناسانەکان* کە چوار جار چاپکراوەتەوە (قوتابخانەی ئەو توێژەرە گەنجانەی لە دەوری. ژ.م لوتمان خڕبوونەتەوە). ئەم دیاردانە لەم ساڵانەی دواییدا بوونەتە مایەی دڵگەرمی. لەوانەیە هەر لەم لاپەڕانەدا و لە دەرفەتێکیتردا دیسانەوە ئاماژە بۆ ئەم بەرهەمانە بکەم.

سەبارەت بەو ئەرکە پێویستانەی دەخرێنە پاڵ زانستی ئەدەبەوە هەر تەنیا باسی دوو ئەرک دەکەم کە ئەوانیش پێوەندییان بە ئەدەبی سەردەمانی رابردووەوە هەیە و جگە لە تێڕوانینێکی زۆر گشتی شتێکی تر دەرنابڕم. هەڵبەت ئەوەش بڵێم کە ئەرکە سەرەکییەکانی ئاقاری ئەو بابەتانە بەندن بە لێکدانەوەی ئەدەبی هاوچەرخ و رەخنەی ئەدەبییەوە و خاوەن گرنگایەتی و پێویستییەکی زۆرن، بەڵام لێرە باسیان لەسەر ناکەم. ئەو دوو ئەرکەش کە دەمەوێ باسیان لەسەر بکەم لەوێوە بەگرنگیان دەزانم کە بەباوەڕی من گەیشتوونەتە پلەی پێگەیشتوویی و هەر ئێستاکەش بوونەتە هۆی بەدیهاتنی هەندێ بەرهەمی سوودبەخش کە شیاوی پێداچوونەوەن.

زانستی ئەدەب بەر لەهەر شتێ دەبێ پێوەندیی خۆی لەگەڵ مێژووی کولتووردا پتەوتر بکاتەوە. ئەدەب بەشێکی جیاوەنەبووی کولتووره و ناکرێ لەو بەستێنە گشتگیرەی کولتوورێک لەسەردەمێکی تایبەتدا پێکی دەهێنێ، جیا ببێتەوە. نابێ ئەدەب لە



بەشەکانی دیکەی کولتوور جیابکرێتەوە و وەکو باوە بەپشتگوێ خستنی کولتوور بە شێوەیەکی راستەوخۆ بیخەینە پاڵ هۆکارە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانەوە. ئەو هۆکارانە کار لە کولتوور دەکەن و هەر تەنیا لە رێگەی کولتوورو پێوەندیی لەگەڵ کولتوورەوەیە کە لەسەر ئەدەب کاریگەرێتی بەجێدەهێڵین. لە رەوتێکی زۆر درێژخایەندا سەرنجێکی تایبەت دراوەتە بابەتی "تایبەتبوون"ی ئەدەب. دەبێ ئەوەش قبووڵ بکەین کە تایبەتبوونی زێدەڕۆیانە لەگەڵ باشترین دەسکەوتەکانی نەریتی زانستیی ئێمەدا نامۆیە. بۆ نموونە، دەتوانین ئاماژە بۆ ئاسۆی کراوەی لێکدانەوەکانی کۆمەڵێ توێژەرەوە وەکو پوتبیناو ڤسۆلۆسڤکی بکەین. زۆرێک لەم توێژینەوانە بەهۆی شەیدایی زۆریانەوە بۆ "تایبەتبوونی ئەدەب" کۆمەڵێ بابەتی پێوەندیدارو دوولایەنەو کردارو پەرچەکرداری نێوان بەستێنە جیاجیاکانی کولتووریان بە ئەنقەست پشتگوێ خستووەو، زۆربەشیان لە بیریان چۆتەوە کە سنووری نێوان ئەم بەستێنانە رەها نین و هەر سەردەمێک لە رێگەی تایبەتی خۆیەوە دەیان نوێنێتەوە. ئەوان ئەو خاڵەیان لە بیر چۆتەوە کە دیاردەی ئەدەبی، نەک لە ناوەوەی بەستێنە پاشماوەکانی تایبەتمەندییەکانی خۆیدا، بەڵکو لە سۆنگەی سنووری هاوبەشی نێوان ئەم بەستێنە جیاجیایانەدایە کە پرسۆزترین و سوودبەخشترین جۆری ژیان تاقی دەکاتەوە.

لە لێکۆڵینەوەکانی ئێمەدا وا باوە کە تایبەتمەندییەکانی ئەو سەردەمەی دیاردە ئەدەبییەکانی لێکۆڵینەوە لە وێدان ببنە سەرچاوەو، ئەمەش بەبێ ئەوەی کە زۆربەی کات ئەم تایبەتمەندانە لەو تایبەتمەندییانەی لە مێژووی گشتیدا کاربردیان هەیە جیاببنەوە و بەبێ ئەوەی شیکارییەکی تایبەتی هەرە بچووک و تەنانەت جیاواز لە

بەستێنی کولتوور یان کرداری دوولایەنە لەگەڵ ئەدەبدا ئاراستە بکەن. ئەو شیکاریانە، جگە لەمەش، پێشاندەری نەبوونی میتۆدۆلۆژین. ئەوەی ناوی ژیانی ئەدەبیی سەردەمێکی تایبەتی لێنراوە و لێکدانەوەکەی بەبێ گەڕانەوە بۆ لێکدانەوەی کولتووری ئەو سەردەمە سەر دەگرێ، لە راستیدا بۆ ململانێی رووکەشیانەی هۆگرییە ئەدەبییەکان سنووردار دەکرێتەوە و لە بارەی سەردەمی تازەشەوە (بەتایبەت سەدەی نۆزدەهەم) ئەم رەوتە بۆ کۆمەڵێ شەڕی وشەیی نێو گۆڤارو رۆژنامەکان دادەبەزێندرێ کە کارێکی ئەوتۆیان لە ئەدەبی هاوسەردەم نەکردووە. ئەمانە کاریگەرێتی بەربڵاو و توندی کولتوور بەجێیدەهێڵن و (بە تایبەت کولتووری چینگەلی خوارەوە و جەماوەری)، نایخەنە بەر توێژینەوە و زۆربەی کات بە تەواوی پشتگوێ دەخرێ. وەها میتۆد و رێبازێک ناهێڵێ لە قووڵایی بەرهەمە گەورەکان تێبگەین. لەم ساتەوەختەدایە کە ئەدەب دەبێتە یارییەکی بێبایەخ.

ئەو ئەرکەی باسی لەسەر دەکەین- لەگەڵ پرسە پێوەندیدارەکانییەوە (ئەو پرسانەی پێوەندییان بە سنوورەکانی سەردەمێکەوە هەیە کە وەکو کۆیەکی کولتووری رەچاوکراوەو، بۆ خۆی پرسێکی تایبەتە بەچەشنناسیی کولتوورەکان)- کاتێ بە ئاڵۆزییەکی زۆرترەوە دەرکەوت کە بابەتی ئەدەبی بارۆک لە وڵاتەکانی سلاڤدا ئاراستەکرا، بەتایبەت کاتێ باس هاتە سەر (رۆنیسانس و ئومانیزم لە وڵاتەکانی رۆژهەڵاتدا- ئەو باسەی کە تەنانەت ئەمڕۆکەش هەر بەو شێوەیە ماوەتەوە). لەم کاتەدا بوو کە پێویستیی لێکدانەوەی قووڵتری پێوەندییە لێک نەپچڕاوەکانی ئەدەب و کولتووری سەردەمێکی دیاریکراو زیاتر لە جاران هەست پێکرا.



ئەو بەرهەمانەی بەهۆی بەرزیی داهێنانیانەوە ئاماژەم بۆ کردن و لەم سالانەی دواییدا بڵاوکراونەتەوە (وەک بەرهەمەکانی کۆنراد، لیخاچۆڤ، لوتمان و قوتابخانەکەی) سەرباری ئەوەی کە لە باری بنەماکانی رێبازناسییەوە لە یەکتر جیاوازن، بەڵام هەر هەموویان پێشاندەری سەرنجێکی بەردەوامن بۆ جیاکردنەوەی ئەدەب لە کولتوورو، بە مەبەستی تێگەیشتن لە دیاردەیەکی ئەدەبی لە رێگەی جیاوازییەکانی لەگەڵ کۆی کولتووری ئەو سەردەمەدا هەوڵیان داوە. ئەوەش پێویستە بدرکێندرێ کە لەوێوە کە ئەدەب دیاردەیەکی زۆر ئاڵۆزەو، توێژینەوەش لەم ئاقارەدا هێشتا زۆر گەنجە، ناکرێ هیچ میتۆدێک وەکو میتۆدێکی موعجیزەئاسا ناوزەد بکرێ و بەکاربهێنرێ. زۆریی میتۆدەکان رەوایەو لە ئاراشدایە، بەڵام بەو مەرجەی کە ئەم میتۆدانە جیدی بن و هەندێ لایەنی نوێی دیاردە ئەدەبییەکان دەربخەن و قووڵتر بۆی بنوارن.

لێکدانەوەی ئەدەب، جیا لەکۆی کولتووری سەردەم کارێکی زۆر سوودبەخش نییەو، لە لایەکی تریشەوە، ئەگەر ئەدەب هەر تەنیا بۆ چوارچێوەی سەردەمی داهێنان و رۆژگاری بەدیهاتنی سنووردار بکەینەوە، ئەوا ئەم کارەی دوایی لەوەی پێشوو زیانبەخشترە. هۆگریی ئێمە زیاتر بەرەو لای ئەوەیە کە نووسەر و بەرهەمەکانی بەسەرنجدان بە رۆژگارەکەی و رابردووەکەی بخەینە بەرباس و توێکاریی. ئێمە بەردەوام ترسمان لە چوونە دەرەوەی بازنەی زەمەنی و جیابوونەوە لە دیاردەی بەرباس هەیە، کەچی سەرچاوەکانی بەرهەمەکە لە رابردووە دوورەکاندایە. لە دایکبوونی بەرهەمە گەورەکانی ئەدەب پێویستی بە چەندین سەدە هەیە و کاتێ دەردەکەون ئێمە هەر تەنیا میوەیەکی گەیشتوو کۆدەکەینەوە کە

بەرهەمی ڕەوتێکی زۆر ئاڵۆزەو لەسەرخۆیە. ئەگەر هەر تەنیا بەپێی بارودۆخی سەردەم و بەگوێرەی هەڵومەرجی سەردەمی خوڵقاندنی، بەرهەمەکە بخەینە بەر تیشکی شیکاریی و لێکۆڵینەوەوە، ڕێوڕاست وەکو ئەوە وایە کە ڕێگەی ڕۆچوون بەناو قووڵایی و مانای بەرهەمەکاندا بۆ هەتاهەتایە لە خۆمان بەستبێ. وێڕای ئەمەش، زیندانی کردنی بەرهەمەکە لە چوارچێوەی سەردەمی خۆیدا دەبێتە هۆی ئەوەی کە لە ژیانی داهاتووی ئەو بەرهەمە تێنەگەین. ئەو ژیانەی تارادەیەک سەیروسەمەرەو وەکو مەتەڵ وایە. بەرهەم سنوورەکانی سەردەمی خۆی تێک دەشکێنێ و دەبێتە خاوەنی ژیانێکی چەند سەدەیی. بەواتایەکی تر، سەردەمی ژیانی بەرهەم هەر تەنیا بۆ سەردەمی هاوچەرخی خۆی سنووردار ناکرێتەوەو، لێرەدا بەرهەم کاتدارییەکی بەربڵاو لە خۆ دەگرێ و، زۆربەی کات ئەو ژیانەی لەسەردەمەکانی تردا دەی باتە سەر گەلەک پڕ شۆڕتر و گەلەک لە پێشتر لە ژیانی سەردەمی هاوچەرخی خۆیەتی. بە شێوەیەکی گشتی، بەرهەم زۆربەی کات لەلاپەڕە جیاجیاکانی مێژوویی دوورودرێژی خۆیدا دەبێتە خاوەن ماناگەلێکی زۆرتر و، بەواتایەکی تر، لێرەدا بەرهەم لە سەردەمدارییەکی بەربڵاودا جێگیر دەبێ. هیچ بەرهەمێک ناتوانێ لەسەدەگەلی داهاتوودا زیندوو بێ مەگەر ئەوەی کە سەرچاوەی لە سەدەگەلی ڕابردووەوە وەرگرتبێ، ئەگەر بەرهەمێک بەتەواوی لە ئیمڕۆدا لە دایکبووبێ (واتە، لەسەردەمی هاوچەرخی خۆیدا) ئەگەر بەردەوامی نەبەخشێتە ڕابردوو و لەگەڵیدا بەردەوامییەکی جەوهەری نەبێ، ئەوا ناتوانێ لە داهاتووشدا زیندوو بێ. ئەوەی تەنیا هی سەردەمی ئێستایە لەگەڵیدا لەناو دەچێ.



ئەو ژیانەی کە بەرهەمێکی گەورە لە سەدەگەلی داهاتوودا دەی باتە سەر، هەروەک وتم، ژیانێکی سەیرو سەمەرەو مەتەڵدارە. بەرهەم لە ژیانی خۆیدا ماناو واتای تازەش دەگرێتە خۆی؛ دەڵێی بەرهەم لە خۆی و لەوەی لەسەردەمی خوڵقاندنیدا بووە تێدەپەڕێ. دەکرێ بوترێ نە خودی شکسپیەر و نەک هاو سەردەمەکانی، ئەو "شکسپیەرە گەورە" یەی ئەمڕۆ دەیناسین نەیان دەناسی. گیان کێشانی ئەم شکسپیەرەی ئێمە لە سەردەمی ئیلیزابێتدا نامومکین بوو. بلینسکی لەسەردەمی خۆیدا دەیگوت هەر هەلومەرجێکی (مێژوویی) تازە بۆ خۆی لەبەرهەمە گەورەکانی ڕابردوودا شتێکی تازە دەدۆزێتەوە. ئەم وتەیە چ مانایەکی هەیە؟ ئایا ئێمە شتێکی نوێ دەخەینە سەر بەرهەمەکانی شکسپیەر؟ ئایا ئێمە شتێک دەخەینە سەر ئەم بەرهەمانە کە پێشتر لەواندا نەبوو؟ مۆدێرنیان دەکەینەوە؟ بەلاڕێیاندا دەبەین؟ مۆدێرنسازی و بەلاڕێدابردن بەردەوام لە ئارادا بووە و، دیسانەوەش سەر دەگرێ. گەورەیی شکسپیەر پێوەندیی بەم بابەتانەوە نییە. شکسپیەر بۆیە گەورەیە کە لە ڕاستیدا لە بەرهەمەکانیدا شتێ لە ئارادا بووەو هەیە کە نەک خۆی و نەک هاوسەردەمەکانی لە توانایاندا نەبووە لە بەستێنی کولتووری ئەو سەردەمە تایبەتەدا هەڵیسەنگێنن.

لایەنە جیاجیاکانی مانای بەرهەمێک لەوانەیە بە شێوەیەکی حەشاردراو و بەزەبر لە ئارادابن و دەرنەکەون مەگەر ئەوەی کە بەستێنێکی ترو لە هەناوی کولتووری سەردەمەکانی دواییدا ئەم مانایانە بکەونەڕوو. ئەو خەزێنە ماناییانەی شکسپیەر لە بەرهەمەکانیدا داینـاون لە درێژایی چەندین سەدەو بگرە چەندین هەزارەدا کۆکراونەتەوە. ئەم خەزێنانە لە زماندا شاردراونەتەوە- نەک

هەر لە زمانی نووسینداو بەڵکو تەنانەت لەو بەشانەی زمانی جەماوەریشدا کە بەر لە شکسپیەر نەچووبوونە نێو ئەدەبەوە - "ئەم خەزێنانە" لە جۆرە جیاجیاکانی شێوەو چەشنەکانی پێوەندیی گوتەییدا لە ئارادان، لە شێوە بەهێزەکانی کولتووری جەماوەریدا لە ئارادان (بەتایبەت لە شێوە کارناڤاڵییەکاندا) کە هەر هەموویان بەدرێژایی هەزاران ساڵ لە جۆرە جیاجیاکانی دیمەنە شانۆییەکاندا (وەک پرسەکان و شاییەکان) بیچمیان گرتۆتەخۆ. دەگەڕێتەوە. لە ئەنجامدا ئەمانە هەر هەموویان لە شێوە جیاجیاکانی هزرو ئەندێشەدا لە گۆڕێدان. شکسپیەر وەک هەر هونەرمەندێکی تر بەرهەمەکانی لەسەر بنچینەی شێوەگەلی لێواولێو لە ماناو واتا دەخوڵقاندو نەک لەسەر بناخەی توخمە مردووەکان و قاڵبە ئامادەکان. بەڵام تەنانەت قاڵبیش خاوەن رواڵەتێکی دیاریکراوی شوێنییە و، کەواتە لەسەر دەستی بەرهەمهێنەرەکەی دەربڕی شتێکی دیاریکراوە.

لە راستیدا ئەمە چەشنەکانن کە مانایەکی تایبەتیان هەیە. چەشنەکان (وەک چەشنە ئەدەبی و چەشنە زمانییەکان) بە درێژایی ئەو سەدانەی کە بوونیان بەردەوامە کۆمەڵێ شێوەی دنیابینی و ئەندێشە لە خۆدا کۆدەکەنەوە. نووسەری کارامە چەشن وەکو کلێشەیەکی دەرەکی بەکاردەهێنێ. بەڵام نووسەرێکی مەزن پانتا ماناییە شاراوەکانی نێو چەشنەکان دەدۆزێتەوە. شکسپیەر خەزنەگەلێکی گەورەی مانای بەزەبری بەکارهێناوەو لە بەرهەمەکانی خۆیدا جێگەی بۆ کردوونەتەوە، ئەمەش ئەو  مانایەیە کە لەسەردەمی خودی شکسپیەردا نەدۆزرایەوە و یاخود خەڵک بەتەواوی لێی تێنەگەیشتن. نووسەر و هاوسەردەمەکانی بەر لەهەر شتێکی تر، نزیکترین بابەتەکانی بارودۆخی سەردەمی خۆیان هەست پێدەکەن و



هەڵی دەسەنگێنن. نووسەر دیلی سەردەم و چەرخی خۆیەتی. ئەو سەردەمانەی پاش ژیانی نووسەر سەرهەڵدەدەن نووسەر لە چنگی ئەم دیلایەتییەوە رزگار دەکەن و ئەرکی زانستی ئەدەبیش جۆرێکە لە یارمەتیدانی ئەم رزگارییە.

نابێ ئەنجامی ئەو باسانەی سەرەوە بەم شێوەیە بێ کە سەردەمی هاوچەرخی نووسەر پشتگوێ بخەین و بەرهەمەکانی بۆ رابردوو فڕێ بدەین و یاخود بۆ داهاتوویان تێپەڕێنین. سەردەمی هاوچەرخ پارێزگاری لە گرنگایەتی خۆی دەکات و ئەم گرنگایەتییەش لە هەندێ لایەنەوە دەورێکی دیاریکەرانە دەگێڕێ. شیکاریی زانستی تەنیا لەسەر بنەڕەتی ئەم سەردەمە سەر دەگرێ و لە پێشکەوتنە دواییەکانیشدا دەبێ بەردەوام هەر بۆ ئەو سەردەمە بگەڕێینەوە.

مانای بەرهەمی ئەدەبی، بەهۆی جیاوازییەکانی لە نێو کۆی کولتووریی سەردەمی خوڵقاندنیدا دەردەکەوێ، بەڵام نابێ بەپێی هۆکارە جیاجیاکان هەر لەم سەردەمەدا زیندانی بکەین. کۆی ماناکانی بەرهەم دەرناکەوێ مەگەر لەسەردەمە جیاجیاکاندا و لە کاتدارییەکی بەربڵاودا.

هەر بەهەمان شێوەش. نابێ کولتووری سەردەمێکی دیاریکراو وەکو شتێکی تەواوبوو و بە ئەنجام گەیشتوو لە قەڵەم بدەین کە هی رابردوویەکی دوور و مردوو و نەگەڕاوەیە. ئەندێشەی شپێنگلر کولتووری سەردەمێکی دیاریکراو وەکو بازنەیەکی داخراو لە بەرچاو دەگرێ، بەڵام با ئەمەش بڵێین کە کۆی کولتوورێکی دیاریکراو، کۆیەکی کراوەیە.

هەرکام لەم کۆیانە (بۆ نموونە، سەردەمی کۆن)، بەپێی ئەوەی تۆزێ رەسەنایەتی خۆی بدۆڕێنێ، لە نێو رەوتی یەکبوونی

پەروەرشتی کولتووری مرۆڤدا جێگەیەک بۆ خۆی دەستەبەر دەکا. هەر کولتوورێک بۆ خۆی خاوەنی ئەو بەربڵاوییە ماناییەیە کە لە ژیانی مێژوویی ئەو کولتوورەدا نەدۆزراونەتەوە و یاخود تیشکیان نەخراوەتە سەر. سەردەمی کۆن ئەو جۆرەی ئێمە دەیناسین خۆی ناناسیێت. منداڵانی قوتابخانە نوکتەیەکیان هەیە کە دەڵێ: خەڵکی یۆنانی کۆن سەبارەت بە خۆیان نەیان دەزانی کە بابەتەکە چییە – ئەوان نەیان دەزانی کە خەڵکی یۆنانی کۆنن و هیچ خۆیان بەم ناوەوە بانگ نەدەکرد. گومانیش لەوەدا نییە کە لەو مەودا زەمانییەیدا کە یۆنانییەکانی کرد بە خەڵکی یۆنانی کۆن مانایەکی گرنگ سەبارەت بە گۆڕانکاری هەیە– ئەم مەودایە بە دۆزینەوەی بەهاو بایەخە تازەکانەوە بەردەوام مانایەکی دیاریکراو دەگرێتە خۆی کە خودی یۆنانییەکان (لەم مانا تازەیە) بێئاگابوون، هەر چەندەش بۆ خۆیان داهێنەری بوون. شکسپیەر لە ڕێگەی شیکاریی وردی کولتووری کۆنەوە هەندێ قووڵایی تێدا بەدی کرد. هەڵبەت شکسپیر کۆمەڵێ شتی خستۆتە سەر ئەم کولتوورە کۆنە، بەڵام زیادەکانی شکسپیەر بە مەبەستی وەدەست هێنانی کۆیەکی یەکگرتوو و کاملتر بووە و، ئەم کارە گرنگەی بە باشی بە ئەنجام گەیاند: واتە، ڕزگارکردنی سەردەمی کۆن لە دیلایەتی سەردەمی خۆی.

لێرەدا دەبێ ئەوە دەست نیشان بکەین کە لێرە مەبەستمان لەو لایەنە قووڵانەیە کە کولتوورەکانی سەردەمانی ڕابردوو مانایان پێ بەخشیبوو، و مەبەستمان تەنیا پەرەپێدانی ناسینی دیاردەییانەی ئەو کولتوورە نییە. لێرەدا مەبەست ئەو ماوانە نین کە لەبەر تیشکی دەستکەوتە یەکلەدوای‌یەکەکاندا و بەهۆی کەندن و دێرینەناسییەوە و دۆزینەوەی دەقە تازەکان و پێشکەوتنی میتۆدی خوێنەری ئەم



دەقانەوە و یاخود سەر لە نوێ چێکردنەوەیان بەدەست هاتوون. سەرجەمی ئەم هۆکارانە هەر تەنیا کۆمەڵێ بنەڕەتی مادیی نوێ بۆ ماناو جەستەی مانا دەخوڵقێنن. سەرەڕای ئەمەش، لە ئاقاری کولتووردا، سنوورێکی ڕەها لە نێوان جەستەو مانادا لە ئارادا نییە: کولتوور لەسەر بنچینەی توخمە مردووەکان ساز ناکرێ و شێوە گشتییەکان لەسەر دەستی سازێنەرەکانیان و لە ڕێگەی شێوەی تایبەتی خۆیانەوە شتێکی ئەوتۆ دەردەبڕن. هەر بۆیەش دۆزینەوەی بنەڕەتە ماددییە نوێکان بۆ مانا تا ڕادەیەک لە بیروبۆچوونەکانی ئێمە سەبارەت بە مانا چاکسازیی دەکەن و تەنانەت لەوانەشە ئەم بنەڕەتە نوێیانە گۆڕانکاریی قووڵ بەسەر بیروبۆچوونەکاندا بهێنن.

ئەندێشەیەک لە ئارادایە کە خەریکی گیان کێشانە، بەڵام بە شێوەیەکی سنووردار و، هەر بۆیەش هەڵەیە. بەپێی ئەم ئەندێشەیە بۆ تێگەیشتنی باشتر لە کولتووری بیانی دەبێ بچین بۆ ئەوێ و لە پاڵ لە یادبردنەوەی کولتووری خۆمان، جیهان لە ڕوانگەی ئەم کولتوورە بیانییەوە ببینین. ئەم ئەندێشەیە هەروەک پێشتر وترا سنووردارە. ئەوەی کە پێویستە کولتووری بیانی ببین و جیهانیش لەو ڕوانگەیەوە ببینین، چاکە: ئەمە قۆناغێکی پێویستە لە ڕەوتی تێگەیشتن لە کولتوور، بەڵام ئەگەر تێگەیشتن پێویستە هەر تەنیا بۆ ئەم قۆناغە کورت و کۆبکرێتەوە ئەوا هیچ شتێ جگە لە نوسخەی ڕووکەشیانەی کولتووری بەرباس ئاڕاستە ناکرێ و ئەمەش خاوەنی داهێنانێکی هەرە بچووکیش نییە.

وەرگرتنی چالاکانەی خودی خود، لە پێگەی خودەوە، دەست لە کولتووری خۆی هەڵناگرێ و هیچ شتێکیش لە بیر ناباتەوە. لە چالاکیی وەرگرتندا، خاڵی هەرە گرنگ بۆ وەرگر، **دەرەوەیەتی** ئەوە لە

کات و شوێن و کولتووردا – واتە دەرەوەیەتی وەرگر لەبەر ئەو شتەی خوازیاریەتی. ئەمەش راست وەکو لایەکی دەرەکیی مرۆڤە کە بۆ خۆی ناتوانێ هەر هەمووی ببینێ و یان بیرێ لێ بکاتەوە و، لێرەشدا ئاوێنە و یاخود رەسمێک لە گۆڕێدا نییە کە یارمەتی بدات. لایەنی دەرەکیی ئێمە تەنیا کەسێکی تر، جگە لە خۆمان دەتوانێ ببینێ، ئەویش بەپێی دەرەوەیەتی. ئەو کەسە بۆ ئێمە **ئەویدی** یە.

لە ئاقاری کولتووردا، دەرەوەیەتی بەهێزترین وزەی هەڵخڕێنەری تێگەیشتنە. کولتووری بیانی قووڵایی و کامڵبوونی خۆی هەر تەنیا لە روانگەی کولتوورێکیترەوە دەخاتەڕوو (جگە لەوەش کە ئەم کولتووره کۆی قووڵاییەکەی خۆی بە تەواوی ئاراستە ناکات، چونکە هەندێ کولتووری دیکە لە رێدان و ئەوانیش بەپێی تێگەیشتنی خۆیان پەرەی زیاتر بەم قووڵاییە دەدەن). قووڵایی واتایەک لە پێوەندیی و رووبەڕووبوونەوەی واتایەکی تردا لەگەڵ واتاگەلێکی بیانیدا دەردەکەوێ: لە نێوان ئەم دوانەدا جۆرێک لە وتووێژ سازدەبێ کە بەسەر سروشتی داخراودا و بەسەر تاکمانایی جەوهەریی ماناداو بەسەر کولتووری تەریک و جیادا زاڵ دەبێ. ئێمە کۆمەڵێ پرسیاری تازە بۆ کولتووری بیانی ئاراستە دەکەین کە بۆ خۆیان تاکو ئێستا بیریان لێ نەکردۆتەوە. ئێمە لە هەناوی ئەم کولتوورەدا بەدوای وەڵامێک بۆ ئەم پرسیارانەدا کە هی ئێمەن دەگەڕێین و کولتووری بیانیش وەڵاممان دەداتەوە و لایەنە تازەکانی خۆی و قوڵاییە تازەو ماناییەکانی خۆی بۆ ئێمە دەردەخات. ئەگەر ئێمە ئەم پرسیارە تایبەتانە ئاراستە نەکەین، خۆمان لە تێگەیشتنی چالاکانەی ئەوەی ئەویدی و بیانییە جیاکردۆتەوە (هەڵبەت لێرەدا مەبەست پرسیارە جیدی و راستەقینەکانن).



رووبەڕووبوونەوەی وتووێژئاسای نێوان دوو کولتوور نابێتە هۆی تێکەڵاوی و لە ئامێزگردنی یەکتر، چونکە هەر کام لەم دوو کولتووره یەکێتی و تەواویی خۆی دەپارێزێ و لە پاڵ ئەمەشدا بۆ یەکتر بەپیت و یارمەتیبەخشن.

سەبارەت بە گۆڕانکارییە دادێکانی زانستی ئەدەبی لەم وڵاتەی ئێمەدا لەسەر ئەو بیروڕایەم کە پانتایی و روانگەکانی ئەم گۆڕانکارییە زۆر دڵخۆشکەر و جێگەی هیوان، چونکە ئێمە کۆمەڵێ ئامرازو بابەتی بەربڵاومان لەبەردەستدایە.

کەمووکوڕیی ئێمە بەڕاستی بێپەروایی زانستیانەی توێژەرەکانمانە کە بە بێ ئەم بێپەرواییەش گەیشتن بە لوتکەکان و رۆچوونە نێو قووڵاییەکان خەیاڵێکی بەتەواوی خاوە.

# پێڕستی نووسینەکانی باختین و ئەنجوومەنەکەی


1. M. Bakhtin, "lskusstvo I otvetstvennost" (L'Art et la Responsabilite), in (42) pp.5-6. Publications anterieures: Den' iskusstva. 1919 et Voprosy Iiteratury 6. 1977.

2. V. N. Voloshinov. "Recerizija na knigu i Glebova o Chajkovskom" (Compie Rendu du Livre de Glebov sur Tehaikovski). Zapiski Peredvi-zhnogo Teatra. in 42. 1922. (D'autres Textes de Volochinov, sur Moussorgski et Beethoven; sont publies dans la revue lskusslvo, Vitebsk, en 1921).

3. M. Bakhtin, "Avtor I geroj v estetichsskoj dejatel'nosti" (L' auteur et l'ctibite persounage dans l'activite esthetique), in (42), pp. 7-180. Publications anterieures partielies: Naprosyv filosofii, 7. 1977, et Voprosy Literatury, 12, 1978. Ecrit Vers 1922-1924.

4. M. Bakhtin, "Problema soderzhanija, materiala I formy v siovesnom. Khudozhestvennom tvorchestve" (Le probleme du contenu, du materiau et de la forme dans la creation artistique verbale), in (41), pp. 6-71. Publication anterieure partielle: Kontekst, 1973. Moscou, 1976. Ecrit 1924.

5. M. Bakhtin, "Lz tekcij po istorii russkoj literatury Vjacheslav. Lvanov" (Extraits des conferences sur L'histoire de la Iiterature russe. Viatcheslav Ivanov), in (42), pp. 374-383. Transcription, par R. M. Mirkina. d'un cours. Profess dans les annees Vingt, probalement vers 1924.





6. V. N. Voloshinov, "Po tu storonu social' nogo" (En deca du social), *Zvezda*, 5. 1925, pp. 186-214.

7. V. N. Voloshinov, " Slovo v zhizni I slovo v poezii" (Le discourse dans la vie et le discours en poesie), *Zvezda*, 6, 1926, pp. 244-267. Trad. fr. Ici meme.

8. V. N. Voloshinov, *Fredizm* (Le Freudisme), Moscou Leningrad, 1927.

9. P. N. Medvedev, "Ocherednye zadchi istoriko-literaturnoj nauki (Les taches actuelles de la science historio- litteraire), *Literatura I Marksizm*, 3, 1928, pp. 65-87.

10. P.N. Medvedev, *Fromal'nyi Metod v Literaturovedenii* (La Methode Formelle en Etudes Litteraires). Leningrad, 1928.

11. V. N. Voloshinov, "Nove jshie techenija lingvisticfaeskoj myslina. Zapade") ( Les courants les plus recents de la pensee linguistique en Occident) *Literatura I Markiszm*. 5. 1928.

12. V. N. Voloshinov, *Marksizm I Filosofija Jazyka* (Marxisme et Philosophie du Langage), Leningrad, 1929. Trad. Francaise: M. Bakhtine (V.N. Voloshinov), *Le Marxisme et la Philosophie du Langage*. Paris. Minuit, 1977.

13. M. Bakhtin, *Problemy Tvorchestva Dostoevskogo* (Problemes de L'euver de Dostoievski), Leningrad, 1929.

14. M. Bakhtin, "Predislovie" (Preface), in L.N. Tolstoj, *Polnoe Sobranie Khudozhestvennykh Proizvedenij*. T.II "Dramaticheslae proizvedenij" (Euvres Dramatiques), Moscou-Leningrad, 1929, pp. 3-10.

15. M. bakhtin, "Predislovie", (Preface), in L. N. Tolstoj, *Polnoe Sobranie Khudozhestvennykh Proizvedenij*. T. 13, "Voskresenie" (Resurrection), Moscou-Leningrad, 1929, pp. 3-20. Trad. Francaise ici- meme.

16. V. N. Voloshinov, "O granickh poetiki I lingvistki" (Des Frontiersentre Poetique et Linguistique), in *Vborbe za Marksizm v Literaturnoj Nauke*. Leningrad, 1930, pp. 203-240. Trad. Francaise ici-meme.

17. V.N. Voloshinov, "Stilistika khudozhestvennoj rechi. 1. Chto takoe jazyk؟" *Stylistique du discourse artistique. 1 . Qu'est-ce que le langage؟. *LiteratumajaUnheba*, 2. 1930, pp. 48-66.

18. V.N. Voloshinov, "Stilistika khudozhestvennoj rechi. 2. Konstrukcija vyskazvanija" (Stylistique du discourse artistique 2. La Structure de L'enonce). *Literaturnaja. Uncheba*, 3, 1930, pp. 65-87. Trad. Francaise ici-meme.

19. V.N. Voloshinov, "Stilistika khudozhestvennoj rechi. 3. Slovo I ego social'naja funkcija" (Stylistique du discours artistique. 3. Le dicours et sa fonction sociale); *Literaturnaja Ucheba*, 5, 1930, pp. 43-59.

20. P. N. Medvedev, *Formalizm I Formalisty* (Le Formalisme et les Formalistes). Leningrad, 1934.

21. M. Bakhtin, "Slovo v romane" (Le discours dans le roman), in. (41). pp. 72-233. publication anterieure partielle: Voprosy literatury 6, 1972. Ecrit en 1934-1935.

22. M. Bakhtin, "Roman vospitanija I ego znachenie v istorii realizma"(Le Roman d'apprentissageat sa Sign: Fication dans L'histrie du Rezlisme)in (42), pp. 188-236. Ecrit en 1936-1938.



23. M. Bakhtin "Formy vremeni I khronotopa v romane" (Les formes du temps et du chronotope dans le roman), in (41), pp. 234-407. Publication anterieure partielle: Voprosy literatury 3, 1974 ecrit en 1937-1938 (sauf pour les "Remarques de Conclusion", cf. (39).

24. M. Bakhtin, "lz predystorii. Romannogo slova" (De la Prehistoire du Discourse Romanesque), in (41), pp. 408-446. Publications anterieures partielles: Voprosy literatury, 8. 1965: Russkaja izarubezhnaja Literatura Saransk. 1967. Ecrit en 1940.

25. M. Bakhtin, *Tvorchestvo Fransua Rable I Narodnaja Kul'tura Krednevekovija I Renessansa* (L'oeuvre de Francois Rabelais et la culture populaire du Moyen Age et de la Renaissance), Moscou, 1965. Ectit en 1940 (sauf pour quelques additions). Trad . francaise: M. Bakhtin, *Ouvre de Francois Rabelais et la Culture Populaire au Moyen Age et sous la Renaissance*, Paris, Gallimard, 1970.

26. M. Bakhtin, "Rable I Gogol" (Rabelais et Gogol), in (41), pp. 484-495. Publication anterieure: *Kontekst* 1972. Moscou. 1973. Ecrit en. 1940, retouche, en 1970.

27. M. Bakhtin, "Epos i roman" (L'epopee et le roman), in (41), pp. 448-483. publication anterieure: Voprosy literatury, 1, 1970, Ecrityt en 1941.

28. M. Bakhtin, "k filosofskim osnovam gumanitarnykh nauk" (A propos des fondements philosophiques des sciences humaines), in (42), p. 409-411. publication anterieure partielle: kontekst 1974. Moscou, 1975. Ecritt vers 1941.

29. M. Bakhtin, "problema rechevykh zhanrov" (Le probleme des genresdiscursifs), in (42), pp. 237-280. Publication anterieure partielle: literatumaja ucheba, 1, 1978, Ecritten 1952-1953.

30. M. Bakhtin, "Problema teksta v l ingvistike, filolgii I drugikh gumanitarnykh naukakh. Opy filosofskogo analiza' (Le probleme du texte en linguistique, philologie et dans les autres sciences huamines. Essai d'analyse philosophique), in (42), pp. 281-307. publication anterieure: Voprosy literatury. 10, 1976. Ecrit en 1959-1961.

31. M. Bakhtin, "K pererabotke kingi o Dostoevskom" (Concernat la revision du liver sur Dostoevski), in (42), pp. 308-327. Publication anterieure: Konfekst 1976. Moscou, 1977. Ecrit 1961.

32. M. Bakhtin, *Problemy Poetiki Dostoveskogo* (Problemes de la poetique de Dostoievski), Moscou, 1963. Deuxieme edition modifie de (13), ecrit en 1961-1962, Trad. Francaise: M. Bakhtin, *la Poetique de Dostoievsfd*, Paris. Seuil, 1970.; M. Bakhtine, *Problemes de la Poetique de Dostoevski*, Lausanne.. I'Age d'homme. 1970.

33. M. Bakhtin. In (42). p. 396. Ecrit le ii octobre 1962.

34. M. Bakhtin, "pismo I. I. kanaevu o Gete" (Lette 9.1. kanaev sur Goethe), in (42). pp. 396-397. Ecrit janvier 1969.

35. M. Bakhtin. "Recenzija ma knigu L. E. pinskogo Shekspir" (Compte rendu du livve de L. E. pinski. Shakespeare), in (42), pp. 411-412. Ecrti en. 1970.



36. M. Bakhtin, "Otvet na vopros redakcii Novogo mira" (Reponse a la question du comite de redaction de Novyj mir). in (42), pp. 328-335. Publication anterieure: Nowi mir. 11, 1970.

37. M. Bakhtin "O polifonichnosti romanov Dostoevkogo" (De la polyphonic des romans de Dostoievsksi), Rossija/ Russia, 2, 1975, pp. 189-198. Publication anterieure en Polonais Wspolozesnose, 17-30. October 1971. Enterien accords en 1970 ou 1971.

38. M. Balehtin. "Lz zapisey 1970-1971 godor" (Extraits du notes des notes annes 1970-1971), in (42), pp. 336-360.

39. M. Bakhtin, "Zaidjuchitel'nye zamechanija" (Remarques de conclusion), in (41), pp. 391-407. Conclusion au (23), Ecrit en 1973.

40- M. Bakhtin, "K metodologii gumanitarnykh nauk" (A propos de la methodologoie des sciences humaines), in (42), pp. 361-373. Publication anterieure partielle: Knotekst 1974. Moscou, 1975. Ecrir en 1974.

41. M. Bakhtin. *Voprosy Lliterature I Eestetiki* (Questions deletterature et d'esthetique), Moscou, 1975. Trad. Francaise: M. Bakhtine, *Esthetique et Theorie du Roman*, Paris, Gallimard, 1978.

42. M. Bakhtin, *Estetika Slovesnogo Tvorchestva* (Esthetique de la Creation Verbale), Moscou, 1979 (publie par S. G. Bocharov).

43. "M. M. Bakhtin i M. I. Kagan, po materialam semejnogo arkhiva)" (M. M. Bakhtin et M. I. Kagan, materiaux des archives familiaies), *Pamjat*. 4, 1981 (lettres et documents presentes par K. Nevelskaja).

## ژێدەری نووسینەکانی ئەم بەرهەمە


١. باختین: گەورەترین تیۆری داڕێژەری ئەدەب لە سەدەی بیستەمدا

٢. ژیاننامەی باختین:

Tzvetan Todorov, Mikail Bakhtine, *Le Principe Dilogique*, Seuil, Paris. 1981, pp. 7-27.

٣. باختین: پێشەنگی زمانناسیی کۆمەڵایەتی:

M. Bakhtine (V. N. Voloshinov) *Le Marxismet la Philosophie du Language.* Trans. M. Yaguello, Minuit, Paris, 1977. pp. 7-8.

٤. باختین: بنیاتنەری پاش فۆرمالیزم:

Julia Kristeva, *Litterature et Ideologie*, Collozue de Clung ll, Avril, 1970, pp. 24-25.

٥. دەوری باختین لە پەرەپێدانی ئاقاری کۆمەڵناسیی ئەدەبدا:

Lucian, Goldman, *Marxisme et Sciences Humaines*, Gallimard, 1970, pp. 88-94.

٦. باختین و کۆمەڵناسیی ئەدەب:

Jean-Yves Tadie, *La Critique Litteriar au Xxe Siecle*, Pierre Belfond, Paris, 1984, pp. 168-170.

٧. بژاردە بنچینەکانی باختین:





T. Todorov, Mikhail Bakhtin. *Le Principe Dialogique*… pp. 49-67.

٨. گوتار لە ژیان و شیعردا:

T. Todorov, Mikhail Bakhtin. pp. 181-217.

٩. لەمەڕ پێوەندیی ژێرخان و رووخانەوە:

M. Bakhtin. *Le Marxisme et la Philosohie du Languag*. Pp. 35-45.

١٠. پێداچوونەوە ئەدەبیەکانی ئەمڕۆ:

M. Bakhtin. *Esthetique de la Creation Verbale*. Trans. A Aucouturier, Paris, pp. 339-340.

١١. پێرستی نووسینەکانی باختین و ئەنجوومەنەکەی:

T. Todorove. Mikhail Bakhti. pp. 173-176.